## خەباتی گەلی کورد

لە

یادداشتەکانی

# «ئەحمەد تەقی»دا

لایەرەیەک لە
شۆرشەکانی شێخ مەحمود
و سمکۆ و ھەستانەکەی
ڕەواندز.

ڕێک خستن و ئامادەکردنی بۆ چاپ

جەلال تەقی

زنجیرەی
ھەیەشنە
١٠

١٩٧٠

خەباتی گەلی کورد لە

# یادداشتەکانی

## « ئەحمەد تەقی »دا


ڕێك خستن و ئامادە کردنی بۆ چاپ

**جەلال تـەقی**


« لاپەڕەیەك لە شۆرشەکانی شێخ محمود ، سمکۆ

هەستانەکەی ڕەواندز و پەیوەندی بە وولاٌتانەوە »


**لەسەر ئەرکی کاك ئەحمەدی قەفتان لەچاپ دراوە**

**چاپخانەی ( سلمان الاعظمی ) — بەغدا**

# چەند ووشەیەك دەربارەی ئەم نووسراوە

ئەوەی لە سەرەتای نوسراوەکەی مامە سالحدا ( مێژووی گەلی کورد ) ووتم ئێستەش هەر ئەوە دووبارە ئەکەمەوە کە لە ناو سەرو دەرون و سنگی ئەوانەی مێژووی نزیکی گەلی کوردو رووداوەکانیا بەشداریان کردوە ئەوەندە مەتریالی بەنرخ هەیە ئەگەر بخرێتە سەر کاغەزو بکەوێتە بەردەست ئەوە ئاسۆیەکی نوێی فراوان لە بەر دەم نووسینەوەی سەر لەنوێی مێژووی نزیکی گەلی کورد ئەکاتەوە • جا ئەم نوسراوەش شتێکە وا ، زۆر مەتریالی نوێمان دەربارەی ئەو رۆژە پڕ رووداوانەی دوای شەڕی گێتی یەکەم ئەخاتە بەردەم • زۆر کون و قوژبنمان بۆ روون ئەکاتەوە کە هەتا ئەمڕۆ وەها ئاشکرا روون نەکراونەتەوە • لە پێش هەموو شتێکدا جارێکی ئەو راستیە ئەخاتە بەردەم هەموان کە امپریالیستی انگلیزی قەت پشتی گەلی کوردی نەگرتوە و ئەوەی لە سەرا نەبوە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکا • هەتا ئێستە هەن وا ئەزانن کە ئنگلیز ویستویەتی شتێك بۆ کورد بکا و کورد خۆی مێی نەهێنا • لەم نواسراوەتا ئەم سیاسەتە دوو رووبەی امپریالیستی انگلیزمان بۆئەخاتە روو ، و ئەوەشمان لا روون ئەبێتەوە کە امپریالیستی هەمیشە دوژمنی هەرە گەورەی گەلی کورد بوە و پەرژەوەندییەکانی قەت لەگەڵ پەرژەوەندی بزووتنەوەی رزگاری گەلی کوردا یەکی نەگرتوەتەوە هەروەها ئەوەش دەرئەکەوێ کە شێخ محمود دوژمنی انگلیز بوە و چارەیانی نەویستوە و هەستی بە فرو فێڵیان کردوە و زانیویەتی یاری لەگەڵ ئەکەن بەڵام چاری ناچار بوە چونکە هیچ کوێیەکی تر نەبوە

پشتی بێ بەستێ و پەنای بەرێتە بەر • شێخ محمود هەتا ما هەر دوژمنی ئینگلیز بوو ، باشترین بەلگە ئەو نامەیەیەتی کە بۆ قازی محمد سەرۆکی کۆماری مهابادی نارد بە بۆنەی دروست بووتی کومارەکەوە و کە تیایدا ئەنوسێ : « سیاسەتە میکیافیلیەکەی امپریالیستی ئینگلیزی دەربارەی گەلی کورد لەسەر ئەو رێوشوێنە نەخشە کرابوو کە بزووتنەوەی رزگـاری کورد و گەلی کورد هەمیشە بێ هێزو لاواز و پارچە پارچە بێت هەتا قەت نەچێتە رێگای یەك گرتن و ئەو هێزو توانایەی لا دروست بێ سەرکەوێ ودژی بوەستێ و لەرێ بەرژەوەندەکانیا بێتە کۆسپێکی گەورە » •

هەروەها ئەم نوسراوە گەلێك شتی تریشمان بۆ روون ئەکاتـەوە ، ئەوەش بیروڕا و هەست و نەستی سەرکردەکانی کوردە کە لەو رۆژانەدا مێژووی نزیکی گەلی کوردیان دروست ئەکرد • چوونی نووســـەر بۆ نلو عەشیرەتە کوردەکان هەروەها بەشداربوونی لە بزوتنەوەکەی رەواندز و پەیوەندی لەگەڵ شێخ محمود و سمایل ئاغای ســـمکۆ و بنەمـــاڵەی شەمدینان و بدرخان وبگرە پەیوەندی لەگەڵ کاربەدەســـــتانی تورك و روس ، دەرخستی بیروڕای ئەمانە بەگشـــتی ئەمە بەراستی نرخێـکی گرنگ ئەدا بەم نوسراوە • خۆزگە هەموو ئەو کەسانەی رۆژانی خۆی بەشداری ئەم رووداوە گرنگانەی کەم و زۆر کردوە درێغی نەکا و چی لە بیرماوە بیخاتە سەر کاغەز و بلاوی بکاتەوە ، هەتا بێتە سامانێکی تر و لەسەر رێوشوێنی جارێکی تر بتوانرێ سەرلەنوێ بزوتنەوەی کورد لەو سەردەمەدا بنوسرێنەوە •

**دکتور کاوس قەفتان**

بەغدا ــ مارتی ١٩٧٠

# پێشــــەکی

کە ئەحمەد بەقی لە ١٩٦٠/١/١٣ دا فەرمانی خوای بەجێ هێنا دوو دانە لە یادداشتە دەست ـ نووسەکەی بەجێ مابوو ، یەکێکیان پەڕاوێکی بژارەکراوی ئامادە و ئــەوی تریان یەکەم دەست ـ نووسی ، یان بابڵێین یەکەم مسوەدە ، کە لەسەر چەند بەڕەیەکی جیاجیا نووســـــیبوویەوە داخی گرانم لە ١٩٦٤دا و لەبەر نەبوونی یەکێکی وا لە ماڵەکەدا کـــــە پارێزگاری بکات لەگەڵ زۆر پەڕاوی بەنرخی تردا دانە ئامادەکراوەکەی فەوتابوو • باش بوو پێش ڕۆیشـــتنم بۆ دەرەوەی عراق لە کۆتــایی ( ١٩٦٠ ) دا دانە پەڕەپەڕەکەیانم خزانبوە کونە دیوارێکەوە و ســـواغم دابوو ، و بەمە لە لەناوچوون رزگاری بوو بوو •

خوالێخوش بوو وەك خۆی لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ ئەم یادداشتەی بۆ ئەوە ئەنووسیوەتەوە کە لە چاپی بدات ، بەڵکو پتر بۆ ئەوە بوە کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە نوسینەوەی یادداشتەکانی خۆیدا دەربارەی شۆرشەکانی ( شێخ محمود ) کەڵکی لێ وەربگرێ ـ لـــە کانی خۆیدا دانەیــەکیشی پێشکەش بە مامۆستای خوالێخوش بوو ڕەفیق حیلمی کردبوو ـ وە لەبەر ئەوەی کە پلەی خوێندنەوەی کوردی ئەحمەد تەقی پلەی خوێنــدەواری ئەو کاتەبوە کە تیایدا ژیاوە ئەویش بەهەمان شێوە نووســــــیویەتی • لەبەرئەوە لەکاتی ئامادە کردنی ئەم یادداشتە دا بۆ لە چاپ دان زۆر بە پێویستم زانی کە بیخەمە سەر شیوەی نووسینی تازەی کوردی بەتایبەتی لە ئیملادا هەرچەندە هەندێ کەسیش لەسەر ئەو بیروڕایە بوون کە وەك

خۆی بمێنێتەوە باشترە ، بەڵام چونکە پێشکەوتن و پەرەسەندنی نووسینی تازەی کوردی لەگەڵ جۆری ئەو نووسینانەدا ناگونجێ لەبەر ئەوە بیروڕای گۆڕینی بۆ شێوەی تازە بەسەر بیروڕای هێشتنەوەیدا وەك خۆی زاڵ بوو هەرچەندەش بەپێی توانا هەوڵ دراوە کە پارێزگاری جۆری داڕشتنی رستەکان و قسە راستەوخۆی پێشەواکانی وەك ( سمکۆ ) و ( شێخ محمود ) بکرێ • هەروەها ، وە بۆ ئەوەی کە خوێندەواری بەرێز لە جۆری نووسینی خوالێخۆش بوو شارەزابێ ـ کە ئەمەش تارادەیەك ئەبێتە هۆی شارەزا بوون لە شێوەی نووسینی ئەوکاتە بەتێکرایی ، یان راستتر ، شێوەی نووسینی پیاوانی پەروەردە کراو بە وێژەی ئەو کاتە ـ لەبەر ئەمە دوابەشی یادداشتەکە بەبێ گۆڕینی شێوەی نووسینی و هەتا ( ئیملا )کەشی ، چۆن خۆی نووسیویەتیەوە هەر بەو جۆرە خرایە بەر چاو •

لێرەدا بەپێویستم نەزانی کە من لە ژیانی خاڵە ئەحمەدم بکۆڵمەوە چونکە وەکو خۆی لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ : « ئەو رووداوانەی پەیوەندی هەبێت بە ژیانی گەلەوە زۆر لەوە بەنرخترە کە باسی ژیانی یەکێك بکات » • هەروەها گرنگترین رووداوی ژیانی ئەو ئەوانەیە کە لەم یادداشتەدایە و پەیوەندی بە شۆرشەکانی شێخ محمود و رەواندز و سمکۆوە هەیە • ئیتر بێجگە لەمانە هەرشتێکی تریشی بەسەر هاتبێ دوورە لە رووداوە مێژویەکانەوە و پێویست بە نووسین ناکات •

خوالێخوش بوو زۆر کارەساتی خوێنینی گەلەکەی دیبوو ، بەرادەیەکی وا کە « مەئیوس » بوو بوو لەوەی گەلەکەی بگاتە ئامانج ،

هەتا زۆر جار بەداخ و خەفەتەوە کە ئەم باسانەی ئەگێڕایەوە ئەیـووت : « بەداخەوە ئەو هەلانەی دەست کورد کەوتبوون نەتوانرا بەکار بهێنرێن ، تازە زۆر زەحمەتە هەلی تری وای دەست بکەوێ • » دیارە مەبەستی لەمە زیاتر لەو هەلانە بوو کە دەسـت شـێخ محمود کەوتبوو ، لەم یادداشتەشدا روونی ئەکاتەوە کە هەلە بەتەنها هەڵەی شێخ نەبوە و زۆر لانی تریش لەم هەلانەدا بەشدار بوون •

ئەحمەد تەقی پیاوێکی خێرەومەند و دڵ ساف بوو • بەدرێژایی ژیانی دڵی کەسی نەشکاندوە ، و بەپێی توانا یارمەتی هەموو کەسێکی داوە •

یادی بەخێر بێ و جێگای بەهەشت بێ •

**جەلال تەقی**

بەغدا – ١٩٧٠/٢/٢٦

# سەرەتا

مامۆستای بەرێز و زاناو دۆستی دێرینم رەفیق حیلمی بەگ لە ١٩٥٤ دا نامەیەکی پڕ دڵسۆزی بۆ ناردم و داوای لێ کردم کە هەندێ زانیاری دەربارەی وەزعی کوردستانو سلێمانی لەپێش شۆرشەکانی ( شێخ مەحمودی ) قارەمان و لەکاتی شۆڕشەکەیدا بۆ بنێرم • وە زۆریشی هان دام کە دەست بکەم بە نووسینەوەیەکی تەواوی ئەو کارەسات و روو داوانەی کە خۆم ئاگام لێی بوە • وە فەرمووشی کە خەریکی ئامادەکردنی یادداشتەکانی خۆیەتی بۆ لە چاپ دان •

لەڕاستیدا من لەدەمێکەوە ئەمویست ئەم شتانە بنووسمەوە ، بەلاّم هەر ئەوەندەت ئەزانی وازم لێ ئەهێنا و تەواوم نەئەکرد هەتا ئەو نامەیەی مامۆستای ـ بەرێزم بەجۆرێك هانی دام کە بەگەرمی دەست بکەم بە نووسینەوەی ئەوشتانەی دەمێك بوو لەمێشکمدا پەنگی خواردبوەوە • لە ماوەیەکی کەمدا تەواوم کرد و دانەیەکیشم بەپێی داواکردنی خۆی بۆ مامۆستا رەفیق بەگ نارد • لەراستیدا من ئەم یادداشتانەم بۆ ئەوە نەنووسیوەتەوە کە رۆژێك لەرۆژان بلاّوبکرێتەوە ، من و ئەمە کوجا مەرحەبا ! زیاتر بۆ ئەوەم بوو کە ئەگەر نرخێکی مێژوویی ئەوتۆی هەبێ با مامۆستا رەفیق حیلمی کەڵکی لێ وەربگرێ[1] •

---

(١) مامۆستا رەفیق حیلمی لە بەشی شەشەمی یادداشتەکەیدا ( ١٩٥٨ ـ بەغدا ) کەڵکێکی زۆری لێ وەرگرتوە و زۆرشتی بە یارمەتی یادداشتەکەی ئەحمەد تەقی روون کردۆتەوە •

« ج • تەقی »

زۆر کەس داوام لێ ئەکەن کە بە درێژی باسی ژیانی خۆم بکەم ، ئەمە شتێکی زۆر پێویستە ؟ بە بیروڕای من نە ! چونکە ئەو ڕووداوانەی کە پەیوەندی هەبێت بە ژیانی گەلەوە زۆر لەوە بەنرخترە کە باسی ژیانی یەکێك بکات • لەگەڵ ئەوەشدا ڕووداوێکی سەیر لە ژیانی خۆمدا باس ئەکەم و هیچی تر •

وەك زوربەی لاوانی ئەو سەردەمە لە ناو خێزانێکی دینداردا پێگەیشتبووم و ئارەزووی خزمەتی دینم ئەکرد ، هەر ئەمەش بوو کە وای لێ کردم لەگەڵ چەند دۆستێکمدا شار بەجێ بهێڵین و لەگەڵ دەروێشەکانی شێخدا بچینە خەڵوەتەوە و ماوەی چل ڕۆژ دوور لە ئاوەدانی و شارستانی زیکری خوابکەین و شەو ، و ڕۆژ بە تەزبیحات کردن و ( لا اله الا الله ) بەرینە سەر • نازانم دەرویشەکانی دۆستم چی خێرێکیان لەجەنابی شێخ عبدالکریم دی و چی چاکەیەکیان بەخوا گەیاند ، بەڵام ئەوەی باشی ئەزانم ئەوەیە کە ریخۆڵەکانم هەمووی بە ماشێنە و نیسکێنە خوسایەوە ، چاوەکانم بەهۆی نەبینینی تیشکی ڕۆژەوە کەوتنە ڕەشکەوپێشکە کردن و هەرئەوەندەی مابوو کە لەشم کەڕوو هەڵێنێ ، کە هاتمەوە ماڵەوە و دایکم بینی برۆ درێژەکانم جنگەی تێداوە کەوتە قژ ڕنینەوە و زریکە کردن • ئەمە بووهەموو ئەو کەڵکەی لە خەڵوەتی شێخ وەرم گرت ، وە هەر ئەمەش بوو کەوای لێ کردم ژیاتر دووی کڵاوی بابردوو نەکەوم • زۆر کەس وایان لێك ئەدایەوە کە وازم

له دین هێناوه ، بەڵام ئایا واز له خەڵوەتی تاریك هێنان ئەوه ئەگەیەنێ كه پیاو كافر بوو بێ ؟ ئەوەی وا تێ ئەگات گەردنی ئازاد بێ •

هەرچەندە وازم له خەڵوەت هێنا بەڵام له دڵدا خواپەرستی خـــۆم هەر كردوه و هەر ئەیكەم و كوڕنووش بۆ ئەو هێزه ئەبەم كه هـــموو زیندوو ، و مردووی درست كردوه •

**ئەحمەد تەقی**

سلێمانی ١٩٥٥

# کورد لە سەرەتای جەنگی یەکەمدا

لە شەڕی جیهانی یەکەمدا ، واتا لە (١٩١٤)دا بە ئۆردووەکەمانەوە چووین بۆ سوریا و لەوێشەوە بۆ ( وان ) و ( ئەرزورۆم ) و هەتا شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ ماینەوە • لەو ساڵەدا ، پاش سەرکەوتنی شۆڕشەکەی روسیا و بەجێ هێشتنی هەموو ناوچەکانی تورکیا و قەفقـــاس لەلایـەن لەشکری رووسەوە ، سوپای تورکیا کەوتە پەلاماردانی ئەرمەنیەکان کـە تەنها لەشکری چەکدار بوون لەو ناوچانەدا مابوونەوە پاش کشـــانەوەی لەشکری رووس ، ئەوەی شیاوی باسە ئەوانیش هەر بە چـەکی رووس پڕچەك کرابوون • لە هەموو لایەکدا لەشکری ئەرمەنی شکا و گەڕایەوە دواوە ، وە هەموو ناوچەکانی تورکیا و ئازربایجـــانی رووسی و تفلیس لەلایەن لەشکری تورکەوە داگیر کرایەوە •

لە ناوچە موسڵمانەکانی ئێرە لەژێر فەرماندەی نوری پاشای بـرای ئەنوەر پاشادا « ئیسلام ئۆردووسی » دروست کرا بەونیازەی کـــە ئـەم لەشکرە گەورەیە لە ئێرانەوە پەلاماری ئینگلیزەکان بدات و ( بەغـدا ) بسەندرێتەوە • بەڵام کە لە ١٩١٨ دا ( بولغاریا ) خۆی دا بەدەستەوە و ( محوەر ) شکا و پاش موتارەکە هاوپەیمانەکان چوونە ئەستەموڵەوە ئیتر لەشکری تورك بەرەڵایی تێ کەوت و هێزی نەما ، پاش ئەمەش دووبارە دەسەڵاتی ئینگلیز گەڕایەوە قەفقاس •

لەم کاتەشدا کە ئۆردووەکەی ئێمە گەیشتبوە ( باتومی )[1] خۆی

---

(١) ئێستا باتوومی ئەکەوێتە یەکێتی سۆڤێتەوە •

دا بەدەستەوە و چەکی بۆ ئینگلیزەکان دانا • تابووری ئێمەش کە زوربەی خەڵکی سلیمانی بوو لە باتوومیەوە بەرەو ئەستەموڵ گەڕاینەوە و لە قشلەی ( سەلیمی ) لە ( ئەسکدار ) دابەزین •

لە ئەستەموڵ ، واتا پایتەختی خەلافەت ، هەموو شتێك کەوتبووە ژێر دەستی هاوپەیمانەکانەوە و حوکومەتی تورکیا هەر ناوی مابوو ، بەرادەیەکی وا کە گەڕانەوەی ئێمەش بۆ عێراق ئەبووایە بەپرسی ئینگلیزەکان بوایە • بەم جۆرە لە قشلەی سەلیمی ماینەوە •

رۆژێك لە ئەسکەدارەوە بەرەو ئەستەموڵ سواری پاپۆڕ بووین • لە پاپۆڕەکەدا لەگەڵ جەنابی توفیق بەگی مەحمود ئاغا ، واتا پیرەمێردی خوالێخۆش بوو دا یەکتریمان ناسی کە ئەویش بەرێکەوت ئەوگەشتەی ئەکرد • کە زانی ئێمە خەڵکی سلیمانین و لەسوپا مەرەخەس کراوین و چاوەڕێی ئەوەین ئینگلیز رێگەمان بدات بگەڕێینەوە وولات کەوتە گفتوگۆ دەربارەی « کۆمەڵەی کورد » کە لە ئەستەموڵ بەسەرۆکایەتی شێخ قادری نەهری دروست بوو بوو ، وە ووتیشی کە ئەو ــ واتا شێخ قادر ــ رەنگە بتوانێ چارێکێ گەڕانەوەمان بکات ، وە داوای لێ کردم کە بچمە خزمەتی •

بۆ رۆژی دوایی من بەناوی هاوڕێکانمەوە چوومە خزمەت شێخ ، دوای پاش گفت و گۆیەکی کەم بڕیاری دا کە هەوڵمان بۆ بدات و مۆڵەتی گەڕانەوەمان بۆ بخوازێ ، هەروەها داواشی کرد کە پێش گەڕانەوەمان چاوی پێم بکەوێتەوە چونکە ئیشی پێمە •

پاش چەند رۆژێك بڕیاری گەڕانەوەمان لە رێگای ئەدەنەوە دەرچوو • کە چوومەوە لای شێخ قادر فەرمووی کە لە سلیمانی ئینگلیزەکـــان بـە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود ئیدارەیەکی کوردیان پێـك هێنـــاوە و بەڵێنی دامەزراندنی حوکومەتی کوردستانیشیان بەئێمە داوە • بەڵام وا دیارە وە هەموو نیشانەیەك ئەوە ئەگەیەنێ کە لەگەڵ شـێخ مەحمودا کەوتوونەتـە فروفێڵ ، هەروەها لەگەڵ ئێمەشدا بەراستی نایەنە پێشەوە ، لەبەر ئـەمە بە شێخ مەحمود بڵێ کە هەتا لە توانایدا هەیە جارێ لەگەڵ ئینگلیزەکاندا ئیدارە بکات هەتا بزانین لە ئەنجوومەنی جیهانیدا دەربارەی کوردستان چی بڕیارێك ئەدرێ • هەروەها نامەیەکیشی دامێ بۆ جەنابی شێخ مەحمود •

لە گفتوگۆکەماندا عەرزی جەنابی شێخ قادرم کرد کە بە بیروڕای من نابێ هیچ دڵێك بە ئەنجوومەنە جیهانیەکان ببەستین چونکە هەموو بەڵگە و نیشانەکان وائەگەیەنن کە کەس دڵی بە کورد ناسووتێ و تەنها ئەبێ بە چالاکی خۆمان شتێکمان دەست گیربێ • فەرمووی ئەمە راستە بەڵام بـۆ گەلێکی بێکەسی وەك ئێمە کە جارێ خۆمان هیچمان پێ ناکرێ باشتر نیە وا لە لایەك بکەین پێمان بگەیەنێ ؟ عەرزم کرد ئەمیش راســـتە بـەڵام چاکتر وایە خۆمان زوو نەدەین بەدەست هیچ لایەکەوە چونکە هەر کـە زانیان شلین ئیتر بە بێدەسەڵاتمان تێ ئەگەن و ئەیانەوێ مەرجی خۆیانمان بەسەرا بسەپێنن •

وەلحاسڵ قسەمان زۆر کرد ، لە زۆر شتدا بیروڕامان جیاواز بوو ، لە زۆر شتیشدا رێك کەوتین ، بەتایبەتی گرنگیمان دا بەوەی کە پێویستە شێخ مەحمود هەتا ئەتوانێ جارێ لەگەڵ ئینگلیزدا هەڵ بکات ، چونـکە

تازە تووشیان بوە و چاری کورد ناچارە • خۆ ئەگەر ئینگلیز لە باشەرۆژدا نیازیان باشتربوو ، وە بەراستی ویستیان یارمەتی کورد بدەن وا هەتا سەر پێویستە لەگەڵیان بمێنینەوە چونکە با ئەوانیش مەرجی خۆیان دابنێن ئەگەر بەراستی کەڵکی کوردستانیان بوێ واتیمەش کەڵك بەوان بگەیەنین زیانیچیە ؟

* * *

لەکاتی گەڕانەوەماندا لە ئەدەنە و حەلەبەوە من لە موسڵ نەخۆش کەوتم و لەگەڵ چەند هاورێیەکمدا لەوێ ماینەوە • کە باش چاك بوونەوەم گەڕامەوە بۆ سلێمانی باری شار باش‌نەبوو • لە مزگەوتی گەورە هەواڵی شێخ مەحمودم لەجەنابی مامۆستا مەلا حەمە ئەمین پرسی فەرمووی کە ئێستا لەگەڵ ( مێجەر گرینهاوس )ی راوێژکەری ئینگلیزدا پەیوەندی باش نیە و مێجەر دەربارەی شێخ بیروورای خراپە •

بۆ بەیانی چوومە خزمەتی شێخ مەحمود نامەکەی شێخ قادرم دایە و راسپاردەکانم پێ ووت • فەرمووی کە ئەویش لەگەڵ ئەو بیرورایەدایە کە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بگونجێت و تارادەیەکی زۆر بێ‌دڵیان نەکات بەڵام ئەوان هەر بەهانەی پێ ئەگرن و هەوڵی دەست‌کورت کردنەوەی ئەدەن، لەبەر ئەوە دڵی لێیان کرمێ بووە • وە ووتیشی کە تێ ناگات بۆچی ئینگلیز کردەوەی وایە •

بەڵام ئاشکرایە کە ئینگلیز هەر لە سەرەتاوە نیازی باش نەبوە بۆیە تەگەرەی خستۆتە هەموو شتێکەوە کە کەڵکی نەك هەر کورد ، بەڵکو هەموو گەلانی بەش خوراویشی تێدابوە •

پاش ئەمە لەگەڵ شێخدا دەربارەی باری تورکیا و خەلافـەت زۆر دوایـن •

بۆ ئەوەی بەتەواوی دەربارەی دەوری جەنابی شێخ مەحمود بزانین ای بەباش ئەزانم کە کەمێك لە ژیانی بنووسم •

شێخ مەحمود کوری شێخ سەعیدی حەفیدی کاك ئەحمەدی شێخي کوڕی شێخ مادفی نۆدێیە کە یەکێك بوو لە زانـا مەزنە ئایینـەکـانی کوردستان • هەرچەندە شێخ مارف پتر خزمەتی زبانی فارسیو عـەرەبی کردوە لەگەڵ ئەوەشدا جێگای شانازیەکی گەورەیە بۆ گەلی کورد •

ئەم خێزانە خانەدانەی شێخ مەحمود پتر لە (١٥٠) سـاڵە لـە کوردستاندا ناوبانگیان بلاوە و جێگایەکی تایبەتیان هەیە • هەموو گـەلی کوردستانی ناوچەی سلیمانی وە بەتایبەتی لە لادێکاندا بەچاوی رێـزو پیرۆزەوە تەماشای هەموو وەچەیەکی شێخ مارفیان کردوە • لەبەرئەمەش بوو کە هەر لە منداڵیەوە شێخ مەحمود جێگایـەکی گرنگی لـە دڵی هەمواندا گرتبوو ، بەتایبەتیش کە هەر لە منداڵیەوە ئازایی وچـالاکی و زیرەکی نواندبوو •

نەوەکانی شێخ مارف نەك هەر لە ناو کوردستاندا ریزیـان ئەگیرا بەڵکو لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانیشەوە حسابیان بۆ ئەکرا ،بەرادەیەکی وا کە سوڵتان عبدالحمیدی دووهەم شێخ سەعیدی حەفـیدی بـەمیـوانی بانگ کرد بۆ ئەستەمول شێخ مەحمودیش کە هێشتا منداڵ بوو لـەم گەشتەدا بەشداری کرد • هیچ دوورنیە کە هەر لەو کاتەوە و پاش بینینی

ژیانی شاهانەی سوڵتان بیری پاشـــایەتی و دەســـەڵات داری کەوتبێتـە مێشکەوە •

نەریت و عاداتی کورد ناگۆڕێ ، و هەروەك خۆی ئەمێنێتەوە بۆیە کە پاش گەڕانەوەی شێخان لە ئەستەموڵ دیان ئەستێرەیان نەك هەر لـە بەرزیدایە بەڵکو ئەنانەت سوڵتانیش دڵنەوایان ئەکات هەموو کـەوتبە کوڕنووش بۆ بردنیان و بە هەموو جۆرێك کەوتنە خزمەت کردنیـــان ، ئاغا و بازرگانە دەوڵەمەندەکانی لێ دەرچێت کە لەژێرەوە ناحەزیـــان بوون چونکە دەسەڵاتیان بەهۆی بەرزبوونەوەی شـ ـێخان ئەکەوتــــە مەترسیەوە • هەموو وولات بەسەرزارەکی بوون بە دۆســـتیان ، هیچ دووریش نیە زوربەیان هەر لەبەرئەوە بووبێ کە کەڵکیان لێ وەربگرن • ئەمەش زۆر بە ئاشکرا هەر لە یەکەم ئاوابوونی ئەستێرەی بەختێ شێخان دەرکەوت • ئەوەبوو کە لە ساڵی (١٩٠٨)دا سوڵتان عبدالحمید لابرا و لە سلێمانی لقی کۆمەڵەی « اتحاد و ترقی » لە ئاغا و تاجــر و زابتــە ناحەزەکانی شێخ سعید دامەزرێنرا کەوتنە دوژمنایەتی لەگەڵیاندا و بـــە فیتنە و فزوولی وایان لە حوکومەت کرد لە سلیمانی بەدەست بەسەری بەرەو موسڵ دەریان بەڕێنێ • ئەمەش ئەتوانم بڵێم کە سەرەتای چـــارە رەشی و بێ‌بەختی بوو کە لەوەپاش تووشی شێخان بوو •

ناحەزانی شێخ سەعید بەمە وازیان نەهێنا ، لـە مۆسڵیش کەوتنــە پڕوبیانوو دۆزینەوە و پیلان دانان ، بەجۆرێکی وەها کە لە دووهەم ڕۆژی جەژنی قوربانی ساڵی (١٩٠٨) دا بە تەگبیرێکی چەپەڵانە کـــە ( زەکی پاشا )ی والی موسڵیش بەشداری تێداکرد ـ کە خۆی یەکێك بوو لـــە ئەندامانی کۆمەڵەی ( اتحاد و ترقی ) ـ و لە ئەنجامدا خەڵکی موســـڵ

پەلامارێکی دڕندانەی شێخانیان داو بەیارمەتی کاربەدەستان و پۆلیسی حوکومەت کوشتارێکی زۆریان لێ کردن • شێخ سەعید و شێخ ئەحمەدی کوڕیشی لەناو کوژراوەکاندا بوون •

زۆر کەس ئەیەوێ تاوانی هەڵگیرسانی ئەم ئاژاوەیە بخاتە ئەستۆی شێخان خۆیانەوە و دەوری پیلان گێر و ناحەزەکان بشارێتەوە کە گوایا یەکێك لە خزمانی[2] شێخ سەعید بەسەرخۆشی لە کۆڵانێکی موسڵدا تەقە لە ئافرەتێکی موسڵاوی ئەکات و ڕێگای پێ ئەگرێ و شەڕەکە لەسەر ئەمە هەڵئەگیرسێ ، وە کە گوایا بۆ کڕینەوەی حەیای خۆیان موسڵاویەکان پەلاماری کوردە غەریبەکان داوە • بەڵام ئاشکرایە کە ئەمە کارێکی دەست کرد و ڕێکخراو بوو ئەگینا چۆن ڕێی تێ ئەچێ خزمێکی شێخان بتوانێ بەسەرخۆشی لەگەڵ شێخ ئەحمەد و شێخ مەحمودا بڕوا ، بێجگە لەمەش توانج بگرێتە ئافرەت • هیچ گومانی تێدا نیە کە نەك کەس بەسەرخۆشی لەو کاتەدا نەیان توانیوە لە حوزور شێخدا بوەستن بەڵکو ئەگەر خواردبیشیانەوە نەیان هێشتوە شێخان بەهیچ کولۆجێك پێ بزانن• ئاشکرایە کە ئەم قەلاچۆ تێخستنەی کوردەکان لە موسڵ بە تەگبیری کاربەدەستانی شارەکە بوە ، ئاشکراترین نموونەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە

---

(۲) بەپێی قسەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە بە ی یەکەمی یادداشتەکەیدا ئەو پیاوە خزمی شێخان نەبوە بەڵکو ( بەها ئەفەندی کوڕی عبداللە ئەفەندی حاجی ئیبراهیم ئەفەندی ) خەڵکی کفری هاورێیان بوە کە ئەو کاتە باشکاتبی ئینحساری موسل بوە • لەبەرئەوەی ئەحمەد تەقی ناوی تەواوی ئەو کابرایەی نەهێناوە زیاتر ڕێی تێ ئەچێ کە گێڕانەوەکەی ڕەفیق حیلمی ڕاستتربێ •

ئەو خزمەی شێخانە کە گوایا توانجی لە ئافرەتەکە گرتبوو نەکوژرا ، کە ئەبوایە لەپێش هەموویاندا ئەو لەناو ببرایە •

بەم قەسابی کردنی کوردانە ، واتا بە کوژرانی شێخ سـەعید و هاوڕێکانی ، شێخان لە ناو خەڵکدا پتر ریزیان پەیدا کرد ، و بـوونـە تیشکێکی رووناك کەرەوە بۆ هاندانی زۆر لە کوردەکان کە بیرێك لـە پاشەرۆژی خۆیان بکەنەوە و دۆست و دوژمنیان بناسن • بەڵام بە داخەوە ئەمە هەر لە سنووری بیرکردنەوەدا مایەوە و هەتا ئێستاش دۆسـت و دوژمنمان لێك ناکەینەوە •

پاش کوشتارە خوێناویەکەی موسڵ بە بیانووی ئەوەوە کە ژیـانی ئەوانەی ماون بپارێزرێ شێخ مەحمود و زوربەی تری شێخان کـە لـە موسڵ بوون دەست بەسەر کران و نەهێڵرا بگەڕێنەوە سلێمانی ، بـەڵام کە حوکومەت ـزانی خەریکە کار لە کار بترازێ و عەشایەرە کوردەکـان نیازي پەلاماردانی موسڵیان هەیە ناچـار بەریان دان و بەرەو سلێمانـی گەڕانەوە • ئەو پێشوازیەی کە کران مەگەر هی حەزرەتی عەلی کرابێ پاش گەڕانەوەی لە غەزاکانی ، هەروەها ئەو شیوەنەی کە بۆ شەهیدەکان تازە کرایەوە مەگەر لە مانگی موحەرەمدا بۆ حەسەن وحوسەین کرابێ •

ئا ئەمە بوو باری شێخان پێش هەڵگیرسانی شەڕی جیهانی یەکەم • ئەم کارەساتەش بوو بەهۆی ئەوە کە دووبارە ئەستێرەی شێخان گەش و هەژ بێتەوە و دووبارە هاوکار و دڵسۆزیان زیادی کرد •

پاش ئەمە شەڕی جیهانی یەکەم هەڵگیرسا • کە عوسمانی کەوتە

شەڕەوە ئەم شەڕە عێراقیشی گرتەوە ، چونکە ئەویش بەشێك بوو لە ژێردەسەلاتی عوسمانی •

ئینگلیز لە بەسرەوە دەستیان پێ کرد و بەرەبەرە داگیریان کرد • کە بەغدادیان گرت و بەرەو کەرکوك کشان شێخ مەحمود خۆی پێ نەگیراو بەلەشکرێکی کوردی هەزار سوارەوە بەرەو ڕوویان کشا • دیارە کە شێخ بۆ یارمەتی دانی تورك دژی ئینگلیز کەوتە جەنگەوە مەبەستی ئایینی باڵی پێوە نابوو ، وە هیچی تر ، ئەگینا چۆن وازوو ئەو هەموو زۆرداریەی بیرچوەوە کە تورك نەك هەر لەگەڵ شێخاندا ئەیکرد بەڵکو چەند سەد ساڵێك بوو هەموو گەلی کوردی ئەچەوساندەوە • شێخ بەناوی غەزاوە هەڵی کوتایە سەر لەشکری ڕووسیش وە لە پێنجوینەوە بە ئازایەکی بێهاوتاوە کردنی بەو دیو سفووردا • بەڵام پاش تەواوبوونی شەڕەکە و پاك کردنەوەی ئەو ناوچانە لە دوژمنەکانی تورك ، دووبارە تورکیا وەك هەموو کاتێکی تر کەوتە لێدانی کورد و چەند سەرەك هۆزێکی لێ دانەبەر شەست تیر کە گوایا لەکاتی شەڕەکەدا چەند دێهاتێکیان تالان کردووە ، بەڵام ڕاستیەکەشی لەبەر ئەوە بوو کە دەسەلاتی ئەم کوردانە کەم بکاتەوە بەتایبەتی کە بەهۆی سەرکەوتنە تایبەکانیانەوە دەسەلاتیان لەناو هۆزەکاندا پەرەی سەندبوو •

ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی کە شێخ مەحمود زویر ببێ و لە کاتی گەیشتنی لەشکرەکەی ( ژەنەراڵ ماریشاڵی ) ئینگلیزدا بۆ کەرکوك نامەیەك بنێرێ بۆ وێلسونی حاکمی گشتی عێراق لە ١٩١٨ دا لەم نامە یەدا

داوای لێ کردن کە ئینگلیز یارمەتی بوات بۆ دامەزراندنی حوکومەتێکی کوردی لەسلێمانی لەژێر چاودێری ئەواندا •

تورك بەم نامەیەی زانی ، شێخ مەحمودی گرت و لە مەحکەمەیەکی کەرکوکدا پاش کشانەوەی سوپای ئینگلیزی بەناوی خەیانەتی ولاتـــی عوسمانیەوە بڕیاری خنکاندنی دا،بـەلأم لەترســـی راپەڕینی کوردە لایەنگیرەکانی شێخ زانی نەکرد بیخنکێنێ ، هەروەها بۆ پاشەڕۆژیش ئیشی پێبوو ، چونکە تورك ئەیزانی هەموو کاتێك ئەتوانێ دووبارە شێخ بخەڵەتێنێ و لە شەڕدا دژی دوژمنانی عوسمانی بەکاری بهێنێ • ئەوە بوو لە دواییدا ، وە بەنیازی ئەوەی لە کاتی پێویستیدا کەڵکی لـــێ وەربگرێ بەری دا و بە خەلات و پارەیەکی زۆرەوە لە تشرینی دووهەمی ١٩١٨ دا گەڕاندیەوە سلێمانی و کردی بە قائدی مەدەنی ناوچەکە •

شەڕی یەکەمی جیهانی لە تەواوبووندا بوو ، وە تورکەکان بـــۆ ئەوەی لە ناوچەی سلێمانیدا شێخ مەحمودیان بەدەستەوە بمێنێ بـــۆ هەڕەشە لە ئینگلیز پێ کردنی و ئەو ناوچەیە بپارێزێ و نەیدا بەدەستەوە زۆر دڵنەواییان ئەکرد و بۆ رازی کردنی لەقەبی ( نەقیب )یشیان دایە و لەوساوە بوو بە شێخ مەحمودی نەقیب •

تورکا زۆریش ئەیویست شێخ رازی بکات و لەم کاتـــەدا زویری نەکاتەوە ، بۆیە کە لە تشرینی دووهەمی ١٩١٨ دا بەینی شەڕوەستاندن بلاوکرایەوە ئیحسان پاشای سەرۆکی لەشکری ( ئۆردووی شەشەم ) لە عێراق بە ناچاری فەرمانی دا بە مونەسەریفی سلێمانی کە ئیدارەی ناوچەکە بداتە دەست شێخ مەحمود و خۆی دەرباز بکات • بەم جۆرە شێخ مەحمود

بەناوی حوکومەتی عوسمانیەوە بوو بە متصرفی ئەوێ و حوکمی گرتەدەست •

ئینگلیزەکان ئاگایان لەمە هەموی هەبوو • لە ١٣ ی حوزەیرانی ١٩١٩ دا نوێنەری سیاسی بەریتانی لەبەغدا دەربارەی وەزعی سنووری عراق و کوردستان کە بەپێی بڕیاری پاش جەنگ ئەبوایە دروستبکرایە تەلەگرافێکی بۆ وەزارەتی هندستان لێدا تیایدا وتی : « لەبەر هەندێ هۆی ئابووری و سیاسی و ستراتیجی واباشە کە ناوچە شاخاویە گرنگەکانی وەك سلێمانی و رانیە و کۆیە بخرێتە سەر عراق • هەروەها زاخۆ و دهۆکیش • هەولێر و ئاکرێ و موسڵیش کە هێلی ئاسنینی پێدا ئەروات لە کوردستان جیابکرینەوە ، ئامێدیشیان لە گڵاەبێ • »

شێخ مەحمود ویستی هەل لە کات وەربگرێ • کە بووَ بە متصرفی سلێمانی دووبارە نامەیەکی نارد بۆ ئینگلیزەکان و ئەم جارە داوای لێ کردنە کە بەپێی چەند مەرجێك بێنە سلێمانیەوە •

بە بیروڕای من ئەم داواکردنە کوت و پڕەی شێخ زۆر پەلەی تێدابوو وە وای لە ئینگلیزەکان کرد کە بەچاوێکی ترەوە سەیری بکەن و کەمتر بایەخی پێ بدەن • ئەبوایە ئەو لەم کاتەدا کە بوو بوو بە متصرفی سلێمانی پتر لەگەڵ ئینگلیزدا توند بوایە و ئەوسا ئەوانیش حسابێکی تریان بۆ ئەکرد •

بێ گومان ئینگلیزکان ئەمەیان پێ خۆش بوو ، وە بەڵێنی یارمەتی هەمەچەشنەیان دا بە شێخ ، هەروەها ( ویلسۆن ) بە ناوی خۆیەوە

( میجەر نوئێل )ی نارد بۆ سلێمانی کە ئەفسەرێکی شارەزای خاکـی کوردستان بوو •

بەم جۆرە ئینگلیز بەئاسانی و بەبێ شەڕ و بە پێشوازیەوە هاتـە سلێمانی • ( مێجەر نوئێل ) لە تشـرینی دووهەمی ۱۹۱۸ دا و لـە کوبوونەوەیەکی گشتیدا ، وە بەزبانی فارسی کە چاکی ئەزانی ، بەناوی ( وێلسۆن )ی حاکمی گشتی ئینگلیزەوە بەیعەتی بە شێخ مەحمود کرد و بوو بە(حوکمداری کوردستان ) •

بەڵام بەداخەوە و بۆ نەگبەتی کورد ئەم قارەمانە نەبەزە لەباتـی ئەوەی لەم هەلە کەڵك وەرگری و فەرمان رەوایەکەی بچەسپێنـێ و بیسلاحێنی بەکەڵك بکات کەوتە رێك خستنی یاری و رمبازێن و زیافەت و زیافەت کاری و وازی لە فەرمانرەوایی راستەقینە هێنا • ئەو وای زانی کە ئیتر هەمو شتێك تەواو و کوردستانێکی سەربەخۆ پێك هاتوە و هیچ مەترسیەك نەماوە • زوربەی ئینتهازی و پوولەکیەکانی لەدەور کۆبوەوە و کەوتنە کنە کردن لە بناغەی فەرمان رەوا مۆلەقەکەیدا •

شێخ مەحمود هەرگیز هەلی وای دەست نەکەوتبوو ، وە لەوانەبوو بتوانرایە ئەم فەرمانرەواییەی ببێ بە بەردی بناغە بۆ دامەزراندنـی کوردستانێکی یەکگرتوو ، بەتایبەتی کە هەر لە کاتەشدا ( مێجەر نوئێل ) کەوتبوە پرۆپاگاندە لە شارەکانی تری کوردستانی عراقـدا بۆئەوەی بیانخاتە سەر کوردستانی تازە پێکەیشتو • گومان لەوەدا نیە کە ئینگلیز ئەمەی لەبەر خاتری چاوی رەشی کورد نەئەکرد ، بەڵکو ئەیویسـت

بەهۆی شێخ مەحمودەوە دەسەڵاتی خۆی لە ناوچەکەدا بچەسپێنــــێ ، بەڵام هەرچۆنێك بوایە ئەتوانرا کەڵکێکی باشی لێ وەربگیرێ •

ئەم مێجەر نۆئێله هەرچۆنێك بێ ، ئەگەر بە سەرزارە کیش‌بێ ، وای دەرئەخست کە دۆستی کوردە • زۆر ریزی شێخ مەحمودی ئەگرت و هیچی بەبێ پرسی ئەو نەئەکرد • هەر ئەویش بوو کە لە ۲۷ی تشرینی یەکەمی ۱۹۱۹ دا یادداشتێکی دابەوێلسۆن و تیایدا ووتی :

« ماوەی چوار سەد ساڵە کورد گیرۆدەی دەستی تورکە و هەموو هەوڵێك دراوە کە وەکو گەلێك نەهێڵرێ و بتوێنیرێتەوە • »

( نۆئێل ) زۆر هەولێ ئەدا لە ئینگلیزەکان بگەیەنێ کە چاك وایە هیچ بیانوو بەك بە شێخ مەحمود نەگرن و هەوڵێکی راستەقینە بدەن بـۆ دروست بوون و یەکگرتنی هەموو کوردستان ، بەڵام ئینگلیز ئەم رایەی پەسەند نەئەکرد و لە پێشدا ئەیویست کوردستان دابەش بکات بە چەند حوکومەتێکی بچووکەوە و لە دواییدا بە یەکجاری وازی لەم بیروڕایەش هێنا ، و بە دزیەوە بڕیاری پارچەپارچە کردنی کوردستانی دا کە نوئێل زانی هیچی پێ ناکرێ داوای لە وێلسۆن کرد کە لە حاکمی سیاســـی سلێمانی مەرەخەسی بکات • ئەویش بەخۆشیەوە لای برد و ( مێجـــەر سۆنی لە جێگا دانا •

ئائەمەبوو باری شێخ مەحمودی حوکمداری کوردستان ! هەر لەیەکەم رۆژی هاتنی مێجەر سۆنەوە بۆ سلێمانی کەوتە پیلان دانان بۆ کــــەم کردنەوەی دەسەڵاتی و لەناو بردنی فەرمانڕەوایەکەی • هەر کەسەش لەئاستی خۆیەوە بەبێ ئەوەی پێ‌بزانێ لەمەدا بەشداری ئەکرد •

ئەوانەی کە لە جەنابی شێخ مەحمود نزیك ئەبوونەوە ، و لەدڵیا بایەیەکی باشیان هەبوو زوربەیان خۆیەرست و پوولەکیبوون و ناحەزیان بۆیەکتری ئەکرد ، شێخ خۆی لەسیاسەتدا تازە بوو ، وە ئازاییەکەشی ئەوەندەی تر هەڵەی پێ ئەکرد . وێلسۆن هەرلەسەرەتاوە شێخی خۆش نەئەویست و لەبیانوو ئەگەڕا ، بەڵام ( مێجەر نوئێل ) هەموو هەوڵێکی دا کە وێلسن لە شێخ نەتۆرێنێ ، بۆیە هەر کە مێجەر سۆن هاتە جێگای ئەو ئیتر گلۆلەی شێخ بەرە و لێژی رۆیشت .

مێجەر سۆن لەیەکەم رۆژی فەرمانڕەواییەوە دەستی کرد بە پیلانگێری بۆ کزکردنی دەسەڵاتی شێخ مەحمود . سلێمانی پڕکرد لە مووچەخۆر و نۆکەری عەجەم و ئەفغانی و عەرەب و هندی و گاور و ئەرمەنی . لە هەمو دائرەیەکدا راوێژکەرێکی ئینگلیزی دانا بەناوی موتەرجیمەوە . ئەمە پیاوانی ئینگلیز ! لەو لاشەوە مشکیخوار و خەنجەر لەبەر پشتێن و دەمانچە بەلاقد و تفەنگ لەشان بە ناوی پیاوانی شێخ مەحمووەوە بەشاردوا بلاوبوونەوە.ئەو تاقم و ئەم تاقم کەوتنە وێزەی یەکتری و چاڵ بۆ یەکتری هەڵکەندن . پیاوانی مێجەر سۆن زۆر چالاکانە تەشەنەیان بەم حاڵە ئەدا دەوروپشتانی شێخیش بۆ ئەوەی یاریزگاری جێگای خۆیان بکەن کەوتنە فیتنە بۆ یەکتری هەڵبەستن ، هەتا وای لێهات کە خەڵك لەبەر ئاژاوە و لە خۆ ئەمین نەبوون لە هەموو شتێك بێزار بوو بوون ، ئالەم کاتە ناسکەشدا ئینگلیز کەوتە هاندانی سەرەك هۆزمکان بۆ دوژمنایەتی شێخ مەحمود کردن ، ئەمەش لە رانیەوە دەستی پێکرد .

شێخ ئەمین سندۆلان کە خزمی شێخ مەحمود بوو کرابوو بە قائمقامی رانیە و پارەیەکی باشی ئەدرایە ئینگلیزەکان داوایان لە سەرەك هۆزەکانی

ئەو ناوەکرد کە مەزبەتەیەك دژی شێخ ئەمین بکەنەوە و داوای لابردنی بکەن • زوربەیان رازی نەبوون چۆنکە ئەیانزانی کە شێخ ئەمین بـــە فەرمانی شێخ مەحمود کراوە بە قایمقام و ناتوانن دژی بڕیاری شـــێخ ئەمە بکەن • بەڵام مێجەر سۆن لە سلێمانی وای لە شێخ مەحمود کرد کە بە تەلەگرامێك داوا لە سەرەك هۆزەکان بکات کە لە قسەی کاپتەن بێڵی حاکمی کۆیە دەرنەچن و بڕیاری لابردنی شێخ ئەمین مۆربکەن ئەمـەش بوو بەهۆی ئەوەوە کە زوربەی ئەو سەرۆك هۆزانەش بتمانەیان بە شێخ مەحمود نەمێنێ و لە پاشەڕۆژی خۆیان بترسن • ئەمەش ووردە ووردە کاری کردە ســـەر فەرمان ڕووایەکـــەی شـــێخ مەحمود ، ئـــەو فەرمانڕەوایەتیەی کە لە سەر بناغەی عەشایەری دامەرزابوو !

# شەڕی دەربەندی بازیـان

لەوەیش وئم نامەکەی جەنابی شێخ قادرم ، کە ئەستەمولەوە هێنابوو ، دایە دەست شێخ مەحمودو بەدریژی باسی وەزعی تورکیا و خلافـەئم بۆکرد • شێخ لە کردەوەکانی ئینگلیز زۆر نارەزابوو • بەرادەیەکی وا پاش چەند رۆژێك کە جەنابی شێخ لە توێژەکەی بوەوە لەسەر بـەردە نوێژەکانی مزگەوتی گەورە بانگی کردم و بە جووتە بـەرەو مەرقەدی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ چووین فەرمووی نیازی وایە نوێنەر بنێرێتـە تاران بۆ ئەوەی لای باڵوێزی وولاتە بێگانەکان سکاڵا لە دەست ئینگلیـز بکات • عەرزم کرد کە بە بیروڕای من لەبەر ئەوەی تاران و ئەستەموڵ ، وەبگرە زوربەی جیهان ئیستا لەژێر رکێفی ئینگلیزدایە هیچ وولاتێـك گوێ بۆ سکالای کورد دژی ئینگلیز شل ناکات ، بەڵکو باشتر وایە خۆمان وە بە هێزی چەك و مێشك ، بەیەك خستنی هەموو هۆزە کوردەکـان بەخەڵکی بسەلمێنین کە دڕندەیی ئینگلیز کارمان تێ ناکات و کۆڵمان پـێ نادات هەر وەکو چۆن دڕندەیەتی تورك نەیتوانی کۆڵمان پێ برات •

پاش ماوەیەك بیستم کە شێخ و کۆمەڵەکەی بەنهێنی بڕیاریان داوە نوێنەر بنێرنـــە لای باڵوێزی وولاتان بۆ نارەزایـــی دەربڕین بەرامبەر کردەوەی ئینگلیز لە کوردستاندا وە شکاندنی ئەو بەڵێنانەی داویانـــە بەرامبەر بەکورد •

شێخ هەر بەمەوە نەوەستا ، کەوتە کۆکردنەوە و هاندانی سەرەك هۆزە ناحەزەکانی ئینگلیز و خۆ ئامادە کردن بۆ شۆرشێك کە ئینگلیـــز

له سلێمانی دەرپەڕێنێ • رابەری نارده شارەکانی تری کوردستانی عراق که بیرورایان بزانێ دەربارەی ئینگلیز • له زۆرلاوه هەواڵی وەرگرت که زوربەی شارەکان دژی ئینگلیزن و وەك مەنجەڵ ئەکوڵێن و له کردەوەی ئینگلیز نارەزایی هەتابێ زیاد ئەکات • مێجەر سۆنی شارەزای زبان و نەریت و فولکولۆری کوردیش بەکردەوه ناڕەواکانی ئەوەندەی تر ئاگری نارەزایی خەڵکی خۆش ئەکرد ، هیچ دووریش نیه ئەمەی به عەنقەس کردبێ بۆ ئەوەی بیانووی پەلاماردانی شێخی دەست بکەوێ • یان سەر به شێخ مەحمود دانەوێنێ ، بەڵام خەیاڵی خاو بوو چونکه شێخ لەوانه نەبوو که یەکێکی وەکو مێجەر سۆن کۆڵی پێ بدات ، بۆیه کەوته گفت و گۆ و راکێشانی سەرەك هۆزه گرنگەکان • توانی کەریم بەگی فەتاح بەگی سەرەك عەشیرەتی هەمەوەند و هەباسی مەحمود ئاغای پشدەر و مەحمود خانی دزلی بکات به دۆستی خۆی • هەر بەپشتی ئەمانەش کەوته خۆئامادە کردن بۆ بەرپکردنی شۆرشیك •

شێخ بەدزیەوه مەحمود خانی دزلی راسپارد که بەبیانووی زیارەت کردنی مەرقەدی حاجی کاك ئەحمەدی شێخەوه به لەشکرەوه بێته سلێمانی وبیگرێ و لەدەست ئینگلیز رزگاری بکات •

بەم جۆره مەحمود خن به خۆی و نزیکەی (۳۰۰) چەکدارەوه له ۲۱ ی مایسی ۱۹۱۹ دا گەیشته سەر شاخی گویژەی سنوری سلێمانی • تەنها ئەوسا مێجەر سۆن بەمەی زانی و داوای له ( شێخ مەحمود ) کرد که نەهێڵێ مەحمود خان بێته شارەوه • که شێخ وەرامی دایەوه رێگای ئەوانه ناگیرێ که دێن بۆ زیارەتی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ مێجەر سۆن

داوای کرد کە مەحمودخان خۆی و چەند سوارێك بێ چەك بێن بـــۆ زیارەت و بگەڕێنەوە • شێخ مەحمود ئەم داواکاریەی ڕەت کردەوە و مەحمود خان بەرەوە شار کشا • زۆری پێ نەچوو پاش بەرگریەکی کەم شاری گرت • سەربازە کوردەکانی سۆپای ئینگلیز لەگەڵ دەست بـــێ کردنی شەڕەکەدا لە سوپاکەی خۆیان کشانەوە و چوونە سەر لەشکری کورد • بەم چۆرە لە ڕۆژی ٢٣ ی مایسی ١٩١٩ دا سلێمانی لە لایـــەن کوردەوە گیرا • شێخ مەحمودیش بەناوی پارێزگاری ئینگلیزەکـــان لەکوشتن گرتنی و لە دەبۆکە قایمی کردن • مێجەر دانلیسی سەرلەشکری لیفیش لەناو گیراوەکاندا بوو •

مێجەر سۆن هەر لە سەرەتای هاتی مەحمود خانەوە ، واتا لە ٢١ ی مایسەوە خۆی لە سلێمانی دەرباز کردبو ، وە گرینهاوسی لە جێی خۆی دانابوو • لە هەمان کاتدا ئەو لەشکرەی کە لە کەرکوکیشەوە هاتبـــوو بۆ یارمەتی لەشکرەکەی دانلیس شکێنرا و چەکیان لێ سەندرا •

پاش گرتنی سلێمانی ( وێلسۆن )بە فڕۆکە بە سەر شاردا بەیـــان نامەیەکی بڵاوکردەوە و تیایدا داوای لە شێخ مەحمود کرد کە بـــۆ گفتوگۆ کردن بچێتە بەغدا • شێخ مەحمود چەند مەرجێکی بۆ ئـــەم چوونەی دانا کە وێلۆن پێی رازی نەبوو •

لەبەر ئەوە فەرمانی دا لەشکرێکی گەورە لە کەرکوك پێك هات و بەرەو سلێمانی نێررا • ئەم لەشکرە لەگەڵ لەشکری شێخ مەحمودا لـــە تاسلوجە پیکا هاتن • لە ئەنجامدا ئینگلیز لێرەشدا شلکا ، ئـــەوەی شیاوی باسەپێش ئەمەش مێجەر گرینهاوس بە دیل گیرابوو • بەمە ئەوەندەی تر

ناوی ئینگلیزەکان زڕا و لای خەڵك سووك بوون • ویستیان بە هەر نرخێك بێ حەیای خۆیان بکڕنەوە و چۆك بە شێخ مەحمود دابدەن•بۆ ئەم مەبەستە سەرکردەی گشتی سوپای ئینگلیز لە عراقدا فەرمانی بە جەنەڕاڵ(فرایزەر) دا کە لە موسڵەوە بەخۆی و فرقەیەکەوە بگانە سلێمانی بۆ بەرەنگار وونی شێخ مەحمود، بۆ ئەوەی هێزی کوردەکانی خانەقین و کفریش فریان ئەوە نەکەون کەیارمەتی لەشکری شێــــخ بدەن فرقەیەکــی پیادەش لەژێر سەرکردەیی کۆلۆنێل ( بۆدی ) دا نێررایە دەوری خانەقین بۆ رێگا لێ گرتینان •

لەم بەینەدا لەشکری شێخ مەحمود گەیشتبوە دەربەندی بازیان ، بۆ ئەوەی رێگا لە لەشکری تازەی ئینگلیز بگرێ کە لە کەرکوکەوە بێت بۆ یارمەتی دانی لەشکرە کەی ئەو ناوە شێخ قادری سپاه ســـالاری برای بەخۆی و ( ٥٠٠ ) سوارەوە ناردە نزیك چەمچەماڵ • شێخ خۆشی لــــە دەربەندی بازیان کەوتە خۆ ئامادە کردن بۆ بەرەنگاری ئینگلیز •

ئینگلیز لەم کاتەدا لەوە ئەترسا ئەو عەشیرەتانەی کە هاتا ئێستا داخلی شەڕ نەبوون داخڵ ببن دەوروپشتی چەمچەماڵی بۆردومان کرد •

شێخ لە دەربەندی بازیان چاوەرێی لەشکری دوژمنی ئەکــــرد • داگیرکردنی گەروەکەی دەربەند بۆ دوژمن شتێکی ئاسان نەبوو ، بۆیە شێخ و لەشکرەکەی لەو ە دڵنیابوون کە ئەم ناوچەیە ئەبێتە گۆرستان بۆ لەشکری ئینگلیز و ناتوانن بێن بەم دیوا • شێخ هەرگیـــز لەو باوەڕەدا نەبوو وە بیری لەوە نەئەکردەوە کە یەکێك لە دۆستەکانی خۆی ناپاکــی لێبکمات • ئەوەبوو ( موشیری حەمەی سلیمان ) ی بەگزادەی هەمەوەند

که شێخ خۆی کردبووی بە سەرکردەی لەشکری سـواری چەمچەماڵ ڕێگای پێشانی لەشکری ئینگلیز دا و لەریگەیەکی واوە هێنانی و پشتی لێ گرتن کە شێخ هەرگیز بە بیریدا تەنەهات لەو جێگاوە ئینگلیز بتوانێ بێتە ئەم دیو • شێخی قارەمان ئەوەندەی زانی لەبەرەبەیانی ١٨ ی حوزەیرانی ١٩١٩ دا بەچەکی تازە و زۆرەوە پشت و پێشی لێ گیراوە و فرۆکـەش لە ئاسمانەوە ئاگربارانی ئەکات •

ئەو لەشکرە ئینگلیزیەی هاتبوە ئەم دیوەوە لە هەموو چیزەیەکـی تێدا بوو ، هەتا سیك و مەغۆلەکانی بورماش بەشداریان تێداکرد •

هەردوو لەشکر ئەوەندە ایلك نزیك بوونەوە ناچار دەستیان دایـە شیر و خەنجەر • لەشکری کورد بەژمارە زۆر لە لە شکری دوژمـن کەمتر بوو • ئا لەم کاتەدا بوو کە قارەمان لە دوولاوە بریندار کـرا و بەمە لەشکری کورد شکا و شێخ بە دیل گیرا و بەرەو بەغدا رەوانە کرا •

لەم شەڕەدا (٤٨) قرەمانی کورد کوژرا ، ژمارەیەکی ئێجگـار زۆریش برنیدار کرا (١٢٠) کەسیش بە دیل گیرا •

بەم جۆرە شەڕی دەربەندی بازیان بە شکانی کورد کۆتایی هات ، بەڵام بەمە کورد لاپەڕەیەکی تری لە پاڵەوانیەتی مێژووی پڕ لە کارەسات و خوێناوی خۆی هەڵدایەوە •

جەنەڕاڵ فرایزەر پێش ئەوەی دەنگ و باسی شکاندنی پیشەوا بگاتە سلێمانی بەپەلە لەشکرێکی سوارەی نارده سلێمانی و ئینگلیزە گیراوەکانی لەحەپسی بەردا •

شێخ لەم شەڕەدا قارەمانیەتیەکی وای نواند کە بوە جێی شانازی هەموو گەلی کورد ، بەڵام نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە بەپێی یاسای سوپایی ئەم شەڕە هەڵەی زۆری تێدابوو . نەئەبوو هەموو هێزەکەی لە جێگایەکی وەکو دەربەندی بازیان کۆبکاتەوە و چاوەڕێی هاتنی دوژمن بکات ، باشتر وابوو کە لەشکرەکەی بکات بە چەند بەشێکەوە و لەچەند لایەکەوە پەلاماری سوپای ئینگلیز بدات ، بەمە ئەیتوانی شۆرشەکە بتەنێتەوە لەناو عەشایەرەکانی تریشدا شەڕ هەڵگیرسێنێ دژی ئینگلیز . بەڵام هەر چۆنێك بێ ئەوەی کردی بەڵگەیەکی ترە کە هیچ کاتێك ئەو قارەمانە بەجەرگە نەترساوە و نەیویستوە سەربۆ دوژمنە بەهێزەکەی دانەوێنێ . هەڵویستە پاڵەوانیەکەشی لەبەردەم دادگای عورفی دوژمندا بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەمە . شێخ مەحمود لەبەردەم دادگادا زۆر ئازایانە وەرامی پرسیارەکانی ئەدایەوە ، داوای دادگای رەت کردەوە کە

محامیەك بگرێ چونکە هەر ئیعترافی بەو دادگایە نەئەکرد ، زۆر بەئاشکرا ئینگلیز و میجەر سۆن و گرینهاوسی تاوان بار ئەکرد و ئەوانی دائەنا بە هوێ ئەم خوێن رشتنە . لە ئەنجامدا فەرمان درا بە خنکاندەنی شێخ مەحمود .

کە لەندەن یەنجەی کێشایە حوکمەکەوە و گۆڕی بۆ دە ساڵ گرتن ویلسۆن کە لە زوەوە ئەیویست شێخ مەحمود لە ناو بەرێ دژی ئەم بڕیارە وەستا و لە لەندەنی گەیاند کە هەتا شێخ زیندوو بێ لە کوردستاندا ئاژاوە هەر ئەمێنێ . بەڵام حوکومەتی ئینگلیز نیازی تری لە دڵدا بوو کە لە کاتی خۆیدا بەڵکو بتوانێ کەڵك لە شێخ وەرگرێ . بەم

جۆره حوکمه‌که‌ی گۆڕا به ده ساڵ گرتن و بــــه گیراوی نێرایــــه هیندستان •

دوژمنایه‌تی ویلسۆن له‌گه‌ڵ شێخدا ئه‌وه ئه‌گه‌یه‌نێ که یه‌که‌م لێی تۆقی بوو ، وه هه‌میشه لێی ئه‌ترسا ، وه دووهه‌م به ئاشکرا ده‌ری ئه‌خات که شێخ مه‌حمود دارده‌ستی ئینگلیز نه‌بوه و نه‌بوه نۆکه‌ریان وه‌ك هه‌نـدێ له ناحه‌زانی ئه‌یانه‌وێ ئه‌م ناتۆره ناڕه‌وایه‌ی بخه‌نه دوا • شێخ هه‌ر دوژمنی ئینگلیز بوه و هه‌ر دوژمنیشیانه •

به‌م جۆره ئه‌م شۆرشه‌ی شێخ مه‌حمودی قاره‌مان له سلێمانی به ناپاکی چه‌ند کوردێك و فڕوفێڵی دوژمن و به هێزی ، وه هه‌ڵه‌ی سوپای وسیاسی قاره‌مان و ده‌وروپشته‌که‌ی کۆتایی هات و دووباره پێجه‌ر سۆنی دوژمنی گه‌وره‌ی پێشه‌وا گه‌ڕایه‌وه سلێمانی و به‌مه به‌ته‌واوی حوکمی شار که‌وته ده‌ست ئینگلیز •

# بۆچی کوردەکان تورکەکانیان هێنایە ڕەواندز

پاش ئەوەی کە پێشەوا شکا و ڕەوانەی هندستان کرا ئینگلیزەکـــان لەباتی ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ دانیشتواندا باشـتر بکەن بە پێچەوا نەوە کەوتنە سزادانی خەڵكو بەتایبەتی ئەوانەی کە ســـەر بە شێخ مـەحمود بوون لەناو سلێمانی و دەرەوەی شاردا • هەرچەندەش نوسین و خوێندن بە زبانی کوردی بوو ، و مێجەر سۆن یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لەسلێمانی بەناوی پێشکەوتنەوە دەرکرد لەگەڵ ئەوەشـــدا ئەمانە هەمووی تەنها بۆ مەسڵەحەتی ئینگلیز خۆی بوو ، و هیچی تر •

سۆن زۆر دڕندانە لەگەڵ خەڵکدا ئەجوولایەوە و بوو بوو بـــە کەڵەگا • بەرادەیەکی وا کە بە ئوتومبیلە ـ کەیەوە بە شاردا ئەڕۆیشت هەر کەسێك لەبەری هەڵنە ستایە ئەکەوتە جوێن پێدانی و سزای ئـــەدا هەتا جارێت کەبەبەر دەمماندا تێپەڕی و ئێمە لە بەری هەڵنەستاین گەڕایەوە سەرمان و پێی وتـــین : « بێ ناموســـینە بۆچی لـەبەرم هەڵناستن ؟ » (خاڵە مەلا صالح)م لێی ڕاست بوەوە و جوێنە کـــەی پێ دایـــەوە • خاڵم قسەی لەکەس قوبوڵ نەئەکرد و هـــەقی خۆی بەسەر کەســـەوە نەئـــەهێشت ، وە زۆر جار بەهۆی ئـــەم ڕەوشتەیـــەوە خۆی تووشی چەرمەسەری کردبوو • مێجەر سۆن بۆی دابەزی و بەسەریدا قیژاندی وچەنجوێنێکی تری پێدا و ووتی کـــە ئەیگرێت و ئیعدامی ئـــەکات • خاڵیشم وەرامی دایەوە و دەستی بۆ نێوان هەردوو ڕانی خۆی ڕاکێشا و ووتی : « لە ۰۰۰ م و لە ۰۰۰ م کامیان ئەگری بیگرە ! » • مێجەر سۆن

چەند زللەیەکی لێدا و بە جێیەکەی بردیان بۆقشلە • بو پاش چەند ڕۆژێك دەنگ بلاوبوەوە کە سۆن فەرمانی خنکاندنی بۆ دەرکردوە • شەوێك بە یارمەتی یەکێك لە پاسەوانەکان دەرگای ژووری حەپسخانەکەی شکاند و بۆی دەرچوو • دوایی لە ماڵی حاجی مەلا عەلی مەڵکەندی خزممانەوە بە پەلەپرووزێ و بە پێ هەربەوشەوە بەرەو دێی (خەمزە) دەربازیان کرد و هەتا مێجەر سۆن لەسلیمان مایەوە ئەو سەری نەکردەوە بەشاردا •

مێجەر سۆن بوو بوە بەلا لە شاردا ، هەموو ماڵی خێزانی شێخان بە فەرمانی ئەو تالان کرا ، زەوی و زاریان خرایە ژێر دەست کاربەدەستانی خۆیەوە ، دۆست و نزیکانی شێخ مەحمود دەربەدەر کران و سزا ئەدران • کاربەدەستانی شار لە بێگانە و کلکانی ئینگلیز پێك هاتبوو • عەزیز خانی نەخوێندەواری ئێرانی و قەوم و قیلەکەی بووبوونە کاربەدەست و پیاوماقوڵانی شار و سلێمانی پڕ کرابوو لە هیندی و ئێرانی • باری ئابوریش بە پێچەوانەی پرۆپاگاندەی ئینگلیزەوە هیچ پێش نەکەوتبوو ، گەل هەر برسی بوو ، وە هەر ئەچەوسێنرایەوە •

لەم کاتەدا (ماجد مصطفی)ی خزمم لە تورکیاوە گەڕابوەوە و پێکەوە هاتوچۆی مزگەوتی گەورەمان ئەکرد • لەگەڵ مامۆستا مەلا محمد ئەمین و خوالێخوش بوو شێخ مصطفی شێخ سەلام و چەند گەنجێکی تریشدا نیمچە کۆمەڵەیەکمان پێك هێنابوو •

لە ۱۹۲۰ دا چوومە قەلادزێ بۆ زانینی باری سیاسی ئەو ناوچەیە و

تێگەیشتنی بیرو رای ئاغایانی پشدەر • هەر لەم کاتەشدا شێخ قادری حەفید لەلایەن ئیسماعیل ئاغای سمکۆوە نێررابوو بۆ دەوری سەقز [ چونکە پاش شکاندنی شێخ مەحمود هەموو خێزان ودۆستانی شێخ ئەوەی نەگیرابوو چوو بوونە ئێران بۆ لای سمکۆ ] • من پێش ئێستا ئاغاکانی پشدەرم نەئەناسی و ئەمەش هەلێکی باش بوو بۆ ناسینیان •

که لە مەرگەوە جوولام بەرەو قەلادزێ لەسەر کەلەکی (گەرمکان) لەسەر زێی بچووك چاوم بە عبدالله ئاغای برای هەباسی مەحمود ئاغا کەوت • کە باسی هەباس ئاغام لێ‌پرسی تێی گەیاندم کە ئێستا پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیز و بابەکر ئاغادا باش نیە و لەبەر نەوە قەلادزێی بەجێ هێشتوە و لەدێی هێرۆ نیشتەجێ بوە ، چونکە لە ئێرانەوە نزیکە و لە کاتی تەنگاودا ئەتوانێ خۆی دەرباز بکات و بەرەو ئێران بڕوات ، چونکە سنور بەرەڵایە و حوکومەتی ئێران دەسەلاتێکی ئەوتۆی بەسەر سنوردانیە •

داوام لە عبدالله ئاغا کرد کە ئاگاداری هەباس ئاغا بکات کە ئەحمەد تەقی لە سلێمانیەوە هاتوە و ئارەزووی بینینی جەنابیانی هەیە لە یەکێك لە دێهاتە نزیکەکاندا یان لە هەر جێگایەکدا کە ئەفەرموێ ئەچمە خزمەتی •

پاش چەند رۆژێك پیاوێك هاتە لام و ئاگاداری کردم کە هەباس ئاغا ئەیەوێ لە دێی نورالدین کە دوو سەعات لە قەلادزێوە دوورە بمبینێ ، منیش بە ناوی خوری و ئاژەڵ کڕینەوە بەرەو ئەو دێیە

چووم • لەژێر سێبەری دارتووی سەرکانیەکی نزیك دێیەکەدا هەباس ئاغا و ئاغای قەرەنی چاوەڕێیان ئەکردم •

که کەوتینه گفت‌وگۆکردن بۆم دەرکەوت که هەباس ئاغا لەمن بە پەرۆش تره بۆ ئیش کردن و فەرمووی که مێجەر سۆن و بابەکر ئاغا رێك کەوتوون بۆ ئەوەی ئێمه بکەن بە بەندەی خۆیان و هەموو هەوڵێك بۆ جێبەجێ کردنی ئەم پیلانه ئەدەن • فەرمووشی که پاش هاتنی مێجەر سۆن بۆ سلێمانی و که جەنابی شێخ مەحمود لەگەڵیدا پەیوەندی تێك چوو بوو بە فەرموودەی شێخ چووین بۆ سلێمانی ولای شێخ میوان بووین • له تەرەف دایەرەی سیاسی ئینگلیزیەوه بانگ کراین و براینه لای مێجەر گرینهاوس • لێی پرسین که بۆچی هاتووین بۆ سلێمانی ، ئایا هەر لەخۆمانەوه هاتووین یان شێخ مەحمود هێناونی ؟ گرینهاوس دیار بوو که لەم پرسیارەدا مەبەستێکی هەیه و ئەیەوێ نرخی ئێمه کەم بکاتەوه ، بۆیه خۆم نەگرت و وەرامم دایەوه (واتا هەباس ئاغا وەرامی دابووەوه) و وتم : « نەخێر خۆمان هاتووین » • دوایش پێم ووت : « جەنابی حاکم ، زۆر سەرسامم ، وکردەوەی جەنابتان سەیره ، هەتا کاتێك بوو مەئموری خۆتان [ مەبەستی له مێجەر نۆئێله ] ئێمەی بەزۆر ئەهێنا و بەیعەتی بە شێخ مەحمود پێ ئەکردین ، کەچی ئێستا وەکو تاوانێکمان کردبێ که هاتووین بۆلای ئەو شێخ مەحمودەی کەخۆتان بە زۆر ئەتان هێنایین بۆلای • رەنگه ئێوه ئێمه بە مەیموون بزانن و وابێ بگەن

ئەشێ هەر ڕۆژە بە چەشنێك هەڵمان بەڕێنن ؟ ئەگەر وا تێبکەن بەهەڵەدا چوون • »

هەباس ئاغا ووتی : « پاش ئەمە مێجەر گرینهاوس بە سەرسامیەوە سەیری کردم و ئیتر ووتەی نەکرد ، و هەســـتا و چوو بۆ لای مێجەر سۆن • زۆری پێ نەچوو ئێمەشیان بانگ کردە لای خۆیان • وامان زانی مێجەر سۆنیش لەم ڕووەوە لەگەڵماندا ئەدوێ ، کەچی هیچ باسی ئەمەی لەگەڵا نەکردین و لە ئـەحواڵ پرسین وبەخێرهـاتن بـەولاوە دەربارەی هیچی تر نەدوا • پاش ئەوەی کە لە دایەرەی سیاسی دەرچووین یەکسەر بەرەو ماڵی شێخ مەحمود ڕۆیشتین ، وە هەر لەو کاتەوە و هەتا ئێستاش مێجەر سۆن مِن بە دوژمنی خۆی تەماشا ئەکات • »

بەم جۆرە هەباس ئاغا ڕوونی کردەوە کە نە مێجەر سـۆن حـەز لە چارەی ئەو ئەکات و نە ئەویش چارەی ئەوی ئەوێ •

پاش ئەمە هەواڵی شێخ قادرم لێ‌پرسی ، فەرمووی کە گوایا شـێخ قادر هیچی پێ نەکراوە و ئەو کارەی پێی سپێرابوو نەیتوانی جێبەجێی بکات چونکە یەکسەر لەلایەن ئینگلیز و ئێرانیەکانەوە تەوقیف کراوە و ناشزانین بۆ کوێیان بردوە •

دوایی هاتینە سەر ئەوەی بڕیارمان دا هەتا من لە قەلادزە ئەمێنمەوە جەنابی هەباس ئاغا لەگەڵ دۆستو خزم و ناسیاوە تێگەیشتوەکانیدا قسـە بکات و منیش لەلای خۆمەوە هەوڵ بدەم بۆ دۆزینـەوە و پەیداکردنـی بزووتنەوە یەك کە دەسەو دایەرەی مێجەر سـۆن و بابـەکر ئاغا تێك

بدەین • پاش ئەمە من بەرەو قەڵادزە گەڕامەوە و هەباس ئاغا بەرەو هێرۆ •

لێرەدا ئەمەوێ کەمێك بگەڕێمەوە سەرباسی پەیوەندی شێخ مەحمود ومێجەر سۆن کە لەوەپێش لێی دواین بۆ ئەوەی باشتر لە بیروڕای ئاغایانی پشدەر بگەین و زیاتر هۆی نارەزایی خەڵك لە ئینگلیز روون ببێتەوە •

مەعلوومی هەموانە کە لە کاتی موتارەکەی نیوانی حوکومەتی عثمانی و ئینگلیز دا لیوای سلێمانی داخلی کاروباری لەشکری ئینگلیز نەبوو ، وە بە دەستی تورکەوە مابوەوە و تورکەکان شێخ مەحمودیان کردبوو بە موتەسەریفی سلێمانی ••• و بەپێی بڕیاری موتارەکە نەئەبوو لەشکری ئینگلیزبێتە ناو سلێمانیەوە ، لەبەر ئەمە مەئمورانی ئینگلیز بەهۆی چەند خوێندەوارێکی کوردەوە لەگەڵ شێخ مەحمودا پەیوەندیان بەست و لەسەرێك هێنانی ئیدارەیەکی کوردی لەژێر سەرکردایەتی شێخدا رێك کەوتن بەومەرجەی شێخ تورکەکان لەسلێمانی دەربکات و بەهاتنی لەشکری ئینگلیز رازی بێ • بەم جۆرە ئەوە بوو مێجەر نۆئێل و هاوڕێکانی بێ ئەزێت هاتنە سلێمانی و بەیارمەتی ئینگلیز هەموو عەشایەرەکانی دەورو پشت بەیعەتیان بە شێخ مەحمود کرد و کەوتنە مەزبەتە کردنەوە کە گوایا کورد نایەوێ لەژێر فەرمانی عثمانیدا بمێنێتەوە و لەژێر چاودێری ئینگلیزدا حەزبە حوکمێکی کوردی ئەکەن • بەڵام لە ژێریشەوە ئینگلیز لەگەڵ زۆر کەسی گرنگی کوردی وەك بابەکری

سەلیم ئاغا و خانمی وەسمان پاشادا بە نهێنی تێئەکۆشا بۆ لەناوبردنی حوکمی شێخ • وە هیچ گومانی تێدا نیە کە وەك مس بێل لە نامەیەکیدا نووسی « پێك هێنانی ئیدارەکەی شێخ مەحمود تەنها شتێکی وەختی بوو و مەبەستی هەر ئەوە بوو کە کەڵك لە دەسەڵاتی شێخ وەربگیرێ بۆ جێگیر کردنی ئینگلیز ئەو ناوچەیەدا » • بۆیە کە مێجەر نۆئێل لەم کارە گرنگەی بوەوە و ئینگلیز بەبێ هەراهاتە سلێمانیەوە ویلسۆن مێجەر سۆنی نارد بۆ ئەوێ و تێك دانی حوکم ڕەوایی شێخی پێ سپارد ، شێخی ناچار کرد پەلاماری ئینگلیزبدات بۆئەوەی بیانووی هەڵگیرسانی شەڕ بخاتە ئەستۆی گوردەوە • واتا ئەتوانین بڵێین کە مێجەر نۆئێل مەئموری پێك هێنانی حوکمی شێخ مەحمود و مێجەر سۆن مەئموری تێكدانی بوو • ئەوە بوو لە ئەنجامدا فەرمان ـ ڕەوایی شێخ تێك چوو • زۆر کەس ئەڵێن کە شێخ مەحمود ئەی توانی پارێزگاری حوکمەکەی بکات ئەگەر بەقسەی ئینگلیزی بکردایە • بەڵام من ئەڵێم بەقسەشی بکردایە حالی‌کورد لەمە چاکتر نەئەبوو ، ئەگینا ئەگەر بیانووی ئینگلیز ئەوە بوو کە شێخ مەحمود بەرەنگاری ئەکردن بۆچی پاش نەفی کردنی پیشەوا یەکێکی تریان بەناوی حوکومداری سلێمانیەوە لەجێگا دانەنا ویەکسەر فەرمان ڕەواییەکەیان تێك دا و حوکم کرا بە حوکمی ئینگلیز ؟ ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە لێرەدا شێخ مەحمود هەر بیانوویەك بوو بۆ ئینگلیزەکان و هیچی تر ؟ ئەگەر ئەوان بەراستی نیازی دامەزراندنی کوردستانیان هەبوایە ئەیان توانی چۆن لەوەپاش بەزۆر یەکێکیان لەدەرەوە هێنا و کردیان بە مەلیکی عراق و مەملەکەتی عراقیان دروست کرد بەو جۆرەش ئەیان

توانی پیاوێکی خۆیان بکەن بە مەلیکی کوردستان ئەگەر لە شێخ مەحمود رازی نەبوون • هەر هیچ نەبوایە مێجەرسۆن خۆی ئەیتوانی بەناوی نوێنەری حوکمداری کوردستانەوە فەرمان بگرێتە دەست هەتا گەلالەی پیاوێکی تەواوی خۆیان ئەکرد • بەڵام دیارە کە هەرگیز ئینگلیز ئەمەی نەویستوە ، وە هەر لە ئەساسەوە نیازی نەبوە لە وولایەتی موسڵدا کوردستانێکی سەربەخۆ بهێنێتە کایە ، ئەگینا بۆچی بە بیانووی بزووتنەوەیەکی شێخ مەحمودەوە ئەم کوردستانە شی ئێك دا ؟ ئەی بۆچی لە ئەنجامی دامرکاندنەوەی حەرەکەتەکانی مرحوم بەکر صدقی و رشید عالي بەرامبەر ئینگلیز پارێزگاری کیان و سەربەخۆیی حوکومەت و دەوڵەتی عراقی هەر کرد ؟ ئەمانە هەمووی بەڵگەن کە نیازی هەر لە سەرەتاوە خراپ بوە •

ئائەم کردەوە ناڕەوایانەی ئینگلیز بوونە هۆی پەرەسەندنی هەستی دوژمنایەتی لەناو گەلدا و زۆر بوونی ناحەزانی بەرامبەر ئینگلیز ، بەرادەیەکی وا کە زۆر لەوانەی لەوە پێش لەدەرپەڕاندنی تورکدا چالاکیان نواندبوو کە بینیان ئینگلیز لەوان باشتر نیە چاوەڕێی پەیدابوونی هەلێکیان ئەکرد کە ئەم جارە ئینگلیز دەرپەڕێنن ، وە زوربەی ئاغاکانی پشدەریش لەوانە بوون کە ئارەزووی دەرپەڕاندنی ئینگلیز لە کەللەیاندا پەنگی خواردبوەوە • بەم جۆرە ئەتوانین باشتر لە بیروڕای ئەم ئاغایانە بگەین •

× × ×

پاش ئەوەی کە لە جەنابی هەباس ئاغا جیابوو مەوە من لە قەڵادزێ مامەوە • لەوێ زوربەی کات لە گەڵ هەندێ لە ئەهالی سلیمانی و بەتایبەتی

لەگەڵ حسن ئەفەندی مدیری ماڵدا هەڵئەسام و دائەنیشتم و جارجارەش ئەچوومە لای بابەکر ئاغای حاکمی شار • رۆژێك حەسەن ئەفەندی تەکلیفی لێ کردم کە قبوڵی وەزیفەی مأموری تەخمینی گەنم و جۆی قەزای پشدەر بکەم • ئەمە هەلێکی باش بوو کە بتوانم هەموو ناوچەی پشدەر ببینم بۆیە قوبوڵم کرد • ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی زوربەی ئاغاکان بناسم ، دووبارە هەباس ئاغام بینیەوەو لەگەڵ ئاغا مثقفەکانی وەك شێخ ئەمین سندولان و بایز ئاغای هەباس ئاغا و صالح ئاغای ئەحمەد ئاغا لە نزیکەوە پێك گەیشتین • لەم کاتەدا حاکمی سیاسی دەربەند بابەکر ئاغای ئاگادار کرد کە چونکە مأموری تەخمین ئیشەکەی باش کردوە پێویستە بنێرێ بۆ (شاور) لە رانیە بۆ تەخمین کردنی بەروبوومێ ئەویش •

کە چوومە رانیە لای فەتاح بەگی شەهید میوان بووم کە زۆر موعاریزی ئینگلیز و بابەکر ئاغا بوو • ئاگاداری کردم کە لە (کۆیە) بەرامبەر دۆست و مەئمورانی ئینگلیز بزوتنەوەیەك هەیە و جامی رسول ئاغا و زان ئاغای شاور موعاریزی حاکمی سیاسی و بابەکر ئاغا وەستاون ، هەروەها لە رەواندزیش نیشانەی پەیدابوونی شۆرش دەرکەوتوە • پاش ئەمە چوومە شاور و لە گوڵان لای حاجی رەسوڵ ئاغای شاور میوان بووم • ناوبراو فەرمووی کە تایەر ئەفەندی باویل ئاغا ، حەمە شینی سەرچیا و خدر ئاغای کوڕی لەگەڵ شێخانی بجێل و عەشیرەتی سورچی و شێخ کاکە ئەمینی سەلان هێرشیان بردۆتە سەر رەواندز و گرتوویانە ، لەئەنجامدا حاکمی سیاسی ئینگلیز و ئیسماعیل بەگ ناچار بوون کە لە

ڕێگای ناودەشتەوە خۆیان بگەیەننە هەولێر ، وە ئێستا ڕەواندز بەدەست شۆڕشگێڕەکانەوەیە • هەروەها غەفور خانی ناودەشتیش کە لە دەست بابەکر ئاغا و حاکمی سیاسی هەڵاتبوو گەڕاوەتەوە ڕەواندز • بەم جۆرە شۆڕشگێڕەکان لە جموجۆڵان و هەروەها پەیوەندیان لەگەڵ تورکیشدا هەیە •

لەپاش تەواو بوونی تەخمینەکە هاتمەوە رانیە و ئەو زانیاریانەم عەرزی فتاح بەگ کرد ، پاش ئەوە هاتمەوە سندۆڵان و لەوێ کاك شێخ ئەمینم حاڵی کرد کە ئەویش ئاگاداری هەباس ئاغا بکات و خۆشم گەڕامەوە قەڵادزێ • لەم کاتەشدا ماجد مصطفی گەیشتبوە قەڵادزێ و لە دەنگوباسی پشدەرو رانیە و ڕەواندز ئاگادام کرد ، بڕیارمان هاتە سەر ئەوەی کە من بچم بۆ ڕەواندز بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا •

لە قەڵادزێوە چوومە سندۆڵان ، هەباس ئاغاش تەشریفی هێنایە ئەوێ و دەربارەی وەزع دواین ، پاش ئەمە لەگەڵ پیاوێکی شێخ ئەمیندا کە (حەمید)ی ناو بوو بەرەو رانیە چووم بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستیدا دەنگوباسی پێدا بنێرم •

لە رانیەوە شەوێ چوومە لای حاجی رەسول ئاغا و لە گوڵانی شاور و لە ڕێگای شاخی سیوکانەوە چوومە دێی سەلان و بۆ سبەینێ گەیشتمە ڕەواندز و چوومە لای غفور خان • تێم گەیاند کە هەموو لایەك ئامادەن پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ شۆڕشی ڕەواندزدا ببەستن • پاش

کەمێك لەگەڵ غفور خاندا چووینە لای شۆرشـگێڕەکان و لە گەڵیـاندا کۆبوونیەوە • لەم کۆبوونەوەیەدا باوێڵ ئاغا و نوری کوری و حمـەشینی سەرچیا و خدر ئاغای کوڕی و شێخانی بجێل و شێخ کاکە ئەمین و ئەحمە بەگی بگۆگ و شۆرشگێڕەکانی تر ئامادە بوون • من بەدرێژی باســی وەزعی پشدەر و رانیە و بیروڕای ئەهالیم بۆ کردن و ئەوانیش باسی باری ئەو ناوچەیەیان کرد • هەموویان هاتبوونە سەر ئەوەی کە پێویستە هێزێکی وا هەبێ کورد پشتی پێ ببەستێ ، گومانیش نەبوو کە مەبەســتیان لەم هێزە تورك بوو کە دژی ئینگلیز بشتی پێ ببەستن ، وە دەریشیان خست کــە لەئینگلیز تەواو مەئیوس بوون و هیچ هیوایەکیان پێ نەماوە • تێشـــیان گەیاندم کە شێخانی بجێل ، کە لە عەقرەن و فارس ئاغای زیبار و شێخ ئەحمەدی بارزانی لەگەڵ پیاوانی ئینگلیزدا هەرایان بووە و چەند حاکمێکی سیاسیان کوشتوە • ئینگلیز پاش ئەمە بە لەشکرێکی گەورەی ئاسوری و ەستوریەوە هێرشی بردۆتە سەریان و لەئەنجامدا و پاش شەڕێکی خوێنین فارس ئاغا بەخۆی و لەشکریەوە ناچار بوون کە پەنا بۆ ئیسماعیل ئاغـــای سمکۆ بەرن ، هەروەها شێخانی بجێلیش لـە ناوچە شاخاویەکانی رەواندزا خۆیان حەشار داوە ، هەر لەم کاتەشدا بوو کە یوسف بەگی برای ئەحمەد بەگی بگۆگ لەلایەن ئینگلیزەکانەوە کوژرا • ئەمانە هەموو بوونە هۆی ئەوەی کە لەهەموو لایەکەوە نارەزایی پەیدا ببێ و چاوەڕێی هەل بن بۆ ئەوەی پەلاماری رەواندز بدەن • هەر کردەوە ناڕەواکانی ئینگلیزیش بوو کە هێنا بوونیە سەر بڕوایەك کە بەتێکرایی هـــەموویان بڕیار بدەن لەشکری تورك بهێننە رەواندز بۆ رزگاربوون لـە دەســەڵاتی ئینگلیز ،

بەڕادەیەکی وا کە کەونبوونە پەیوەندی بەستن لـــەگەڵ والی (وان) دا و ووتیان کە وەرامی پشتگیریشیان لێ وەرگرتۆتـــەوە و نامەکەی والیـــان پشمان دام کە پڕبوو لە هاندان و پشتگیری •

لێیم پرسین کە بیروڕایان چۆنە دەربارەی یەك خستنی بزووتنەوەکەیان لەگەڵ راپەڕینەکەی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ ؟ ووتیان لـەگـەڵ سـمکۆدا نامەیان گۆڕیوەتەوە و ئەوەرامدا ووتوویەتی کە ناتوانێ بەشـداری لـــە راپەڕینەکەی رەواندزدا بکات ، دیارە ئێمـــەش ـ واتا شـــۆرشگێڕەکانی رەواندز ـ ناتوانین وولاتی خۆمان بەجێ بهێڵین و بچینە خاکی ئێرانـەوە شۆرش بگێڕین • لەبـــەر ئەمە بڕیارمـان داوە ـ واتا شۆڕشگێڕەکانی رەواندز بڕیارایان داوە ـ و وای بەباش ئەزانین کە هێزی تورك بهێنین بۆ رەواندز بۆ پارێزگاری خۆمان لەدەست ئینگلیز و ئاسوریەکان[1] •

کەلێکم دایەوە بیروڕای عەشایرو ئەهالی قەزای پشدەر و رانیە ش هەمان شتە ، لەبەر ئەوە بە داواکاری شۆرشگێڕەکان رازی بووم کـــە بەنوێنەر و بەناوی ئەوانەوە بچمە وان و لەبـــارەی هێنـــانی سوپاو هێزی تورکەوە بۆ رەواندز لەگەڵ قەدری بەگی والیدا گفتوگۆ بکەم •

---

(١) زۆرکەس ئەیانەوێ ئەوە بسەپێنن بەسەر ئەحمەد تەقیدا کە گوایا ئەو بوە بەهۆی هێنانی تورکەکان بۆ رەواندز ، بـــەلام وەکو لـــەم قسانەی سەرەوە دەرئەکەوێ ، هەروەها لەیادداشتەکانی مامۆستا رەفیق حیلمیش ئاشکرایە کاتێك کە شۆرشگێڕەکان ئەم باسەیان لەگەڵ ئەحمەد تەقیدا کردوە ئەوان لەدەمێکەوە ئەم بڕیارەیان داوە و براوەتەوە • لەبەرئەوە ئەگەر ئەحمەد تەقیش نەبوایە هەر ئەهێنران •

« ج • تەقی »

# چوونم بۆ وان

بەم جۆرە لەکۆتایی تشـــرینی یەکەمی ١٩٢٠دا بووم بە نوێنـەری شۆرشگێرانی کوردستانی جنوبی و بەرەو (وان) لەگەڵ فەتاحی شانەگەردا کە لەوەپێش رابەر و هێنەری نامەبوو لەنێوان والی و شۆرشگێرەکاندا و شارەزایەکی تەواوی رێگاکان بوو ، لەرێگای نەهری و شەمدیناوە کەوتینە رێ ، حەمیدی پیاوی شێخ ئەمینی سندۆلانیشم هەر لەگەڵدابوو •

شنار لەئەنجامی شەڕوا لەلایەن روس و ئەرمەنیـەکانەوە هـەمووی تەفرونوونا و کاول کرابوو ، لەهەموو کۆشکە گەورەکانی شار تەنها ماڵی شێخ قادر و سید طە دیوارەکـــانی بەپێوە مابوەوە • وەکیـــلی قایمقـام و قوماندانی مەفرەزە بەسەربازەکانیەوە لە یەك خانوودا جێنشین بوو بوون •

شـەو لای وەکیلی قایمقـام میوان بوون کە محمود فاضل نـاوێکی خەڵکی عراق بوو ، بێجگە لەوەی کە وەکیلی قایمقام بوو قوماندانی بلۆکی عەسکەری تورکیش بوو لە(نەهری) • لەوەپاشیش ئەم زاتە التحاقی بـــە سوپای عراقەوە کردبوو ، و هەتا پلەی (زەعیم)ی گەیشتبوو • وابزانـــم ئێستا متقاعدە •

ئەوشەوە (محمود فاضل)تێی گـــەیاندم کە پاش ســـەرکـەوتنی لەشکری تورك لە رۆژهــەڵات بەســـەر ئەرمـەنیەکاندا ئێتر (مەجلسي تەئسیسی)و هەموو کوردەکانی ژوورووە ، و وولایاتی رۆژهەڵاتی تورکیا لەگەڵ تورك و (مصطفی کەمال)دا رێك کەوتوون و پەیوەندیان لەگـــەڵ

حوكومەتی خەلیفەدا بڕیوە ، وە وتیشی : (قەدری بەگ) کە لە ئەشرافی دیاربەکرە تازە کراوە بە والی (وان) ، وە منیش ـ واتا محمود فاضل ـ کراوم بە وەکیلی قایمقام . هەروەها (محمود فاضل) ووتی کە گوایا (ئیسماعیل ئاغا)ش لەجێی خۆیەوە پەیوەندی لەگەڵ تورکدا زۆر باشە و لەگەڵ (کاظم قەرە پاشا) ڕێکە و بەهەموو جۆرە چەك و جبەخانەیەك یارمەتیان ئەدا .

ئا ئەمە بوو باری سیاسی ئەوناوە .

بۆ بەیانی لە ڕێگای (گەوڕ)ەوە چووم بۆ (چارێ) بۆ بینینی جەنابی (ئیسماعیل ئاغای سمکۆ) . پاش چەند ڕۆژێك گەیشتمە خزمەتی و کەوتینە گفتوگۆ کردن . ئەو مەعلوماتانەی دەربارەی کوردستانی جنوبی ئەمزانی بە جەنابی سمکۆم ووت . بۆم دەرکەوت کە هەستی ئەو لەگەڵ هەست و بیروڕای ئەهالی کوردستانی جنوبی زۆر جیاوازە . فەرمووی : « ئێستا ئینگلیز زۆر بەهێزە و بەرەنگاری کردنی لەشکرەکانیان بۆ کورد زۆر گرانە . لەو بڕوایە شدا نیم کە تورك بەهێزەوە بەشداری بزوتنەوەکەی ڕەواندزبکات . من وای بەباشتر ئەزانم کە هەوڵ بدەین لە ئێراندا بزووتنەوەکەمان بەهێز بکەین و لێرە بتوانین کورد یەك بخەین و پارێزگاری بکەین . ئەمە بۆ وەزعی ئەمڕۆمان زۆر باشترە » .

گومانی تێدانیە کە(ئیسماعیل ئاغا) ئەم بیروڕایەی لەوەوە هاتبوو چونکە خۆی پەیوەندی لەگەڵ تورکدا زۆر باش بوو ، وە نەیئەویست ئەوان تووشی هیچ ئەزیەتێك بکات ، هەروەها بۆ کەڵکی تورك ئەوە باش

بوو که وەك (سمکۆ) فەرمووی ئەوە بکرێ ، واتا لە ئێراندا ئاژاوە بنرێتەوە و بەهێز بکرێ بۆ ئەوەی بەڵکو تورك بتوانێ خۆی بهاوێژێتە ئەوێشەوە •

عەرزم کرد کە فکری جەنابیان زۆر مەعقولە ، بەڵام بیروڕای شۆڕشگێرەکان لە ڕەواندز زۆر لەمە جیاوازو لەگەڵیدا ڕێك ناکەوێ ، ئەگەرچی لەوانەشە جەنابی هەباس ئاغا و هاوڕێکانی بەمە ڕازی بن • لەبەر ئەمە بڕیارمان دا کە من جارێ لای ئاغا بمێنمەوە و پاش چەند ڕۆژێك هەردووکمان پێکەوە بچینە لای (قەرەنی ئاغای مامش) و ئاگاداری هەباس ئاغا و هاوڕێکانی بکەین کە لە دەوری (سەردەشت) یەکتری ببینین بۆ باس کردنی ئەم مەوزووعە • لەم کاتەدا لە والی (وان)ەوە تەلەگرامێك هات بۆ ئیسماعیل ئاغاکە ئەوشەخسەی لەکوردستانی جنوبیەوە ــ واتا من ــ هاتوە تکایە بەزووترین کاتێك بێت بۆ وان • لەبەر ئەوە (سمکۆ) فەرمووی کە پێویستە بە زووترین کات ئێمە بچین بۆ وان نەك (تورکە ••••)[1] لێمان بکەونە شوبهەوە •

لە ڕێگای (باش قەڵا)وە چووم بۆ وان • لەوێ بەفر هەموو لایەکی داپۆشیبوو • لای مدیری پۆلیس بەناوی والیەوە میوانداریەکی باش کرام • (محمود جودەت)یش لەوێ بوو کە لەدەست (میجەر سۆن)ڕای کردبوو ، وە پەنای بردبوو بۆ تورکیا و کرابوو بە قوماندانی ژاندرمەی ناوچەی (وان) • وەزعەکەم لەویش ــ واتا لە (محمود جەودەت)یش ــ گەیاند •

---

(١) ئەم ووشەیە وادەرئەکەوێ یەکسەر قسەی سمکۆ بێ • لەبەر نرخی مێژوویی کە ووتەی ناسراوێکی وەك سمکۆیە بەپێویستم زانی بەبێ هیچ گۆڕینێك بینووسم •

« ج • ت »

چەند رۆژێك لەوێ مامەوە و هەموو رۆژێك بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ والیدا دەربارەی وەزعی کوردستانی جنوبی و ناردنی مەفرەزەیەکی تورك بۆ رەواندز و زۆر شتی تر ئەدواین ، ئەویش یەك بەیەك قسەکانی ئەگەیاند بە ئەنقەرە . پاش چەند هەفتەیەك والی ئاگاداری کردم کە حوکومەتی مەرکەزی بڕیاری داوە مەفرەزەیەك لەژێر سەرکردەیی (محی الدین بەگ)ی یوزباشیدا بنێرێ بۆ رەواندز ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئیستا زستانە و رێگا سەختە باشتر وایە هەتا بەهار لای من بمێنیتەوە ، (واتا لای والی)، با (فەتاحی شانەگەر)بگەڕێتەوە رەواندزو شۆرشگێڕەکان لەمە دڵنیا بکات کە بەتەواوی هیوایان بەهێز بێ و چاوەڕوان بکەن .

بەم جۆرە فەتاحي شانەگەرمان ناردەوە کە بە نامەیەك ئاگاداریان بکات و منیش لەگەڵ (حامد) دا [٢] مامەوە .

پاش ماوەیەك والی ووتی کە وای بەباش ئەزانێ (حەمید) لەگەڵ قۆمیسەرێکی خۆیاندا لە سنووری ئیرانەوە بنێرێتە لای هەباس ئاغا و هاوڕێکانی و لەمە ئاگاداریان بکات و خەبەرمان بۆ بهێنێتەوە . هەتا ئەوانیش ئەگەڕێنەوە رێگاوبان خۆش ئەبێ و ئەوساش بەمە فرەزەکەوە بچن بۆ رەواندز .

من وام بۆ دەرکەوت کە والی مەبەستی لەوەیە پیاوێکی خۆی بخاتە تەك حامد بۆ ئەوەی لەوە دڵنیابێ ئایا قسەکانی من راستن یان نە، بێ‌کومان

---

(٢) لەوەپێش نووسرا بوو کە ئەو پیاوەی لەگەڵیدا بوو ناوی (حەمید) بوو ، بەڵام لێرەدا بە (حامد)ی نووسیوە لەزۆر جێگای تریشدا جارجار حامد و هەندێ جارێکیش حمید ئەنوسێ ، نازانم کامیان راستە .

« ج . ت »

من بەم پێشنیارەی رازی بووم ، ئــەویش (ئیسماعیل حـەقی) ، کـــە قۆمیسەرێکی خەڵکی سلیمانی بوو بەجلی موڵکیەوە ئامادە کرد و لەرێگای ئێرانەوە نێرران • پێش ئەمە من چەند جارێك ویستم سەرێکی (اسـماعیل ئاغای سمکۆ) بدەم بەڵام والی رێگای نەدام • لەبەر ئەوە بەهەلم زانی و بە ( حامد )دا نامەیەکم بۆ نارد و لـە وەزع ئاگادارم‌کرد ، خۆشـــم لـــە ( وان ) مامەوە •

پاش ماوەیەك (فەتاحی شانەگەر) لە رەواندزەوە هاتەوە • گەیاندی کە شۆڕشگێڕەکانی ئەوێ زۆر بەپـەلە داوای مـــەفرەزەکـە ئەکـــەن و لـــەمە پتر ناتوانن چاوەروان بکـــەن • زۆری پێ نەچوو (حەمیـــد) و قۆمیسەرەکەش لە پشدەرەوە هاتنەوە • ئەوانیش بەپەلە داوای یارمەتی و مەفرەزەکەیان کردبوو • کەوالی زانی قسەکانم راست بوون و لەخۆمەوە ئەم باسەم نەکردوە بڕیاری دا کە مەفردەکە بنێرێ •

لەم کاتەدا زستان بەسەرچووبوو ، وە دنیاش خۆش بوو بوو •

---

# ڕەواندز و مەفرەزەکەی تورك

بەم جۆرە لە نیسانی ١٩٢٢دا[1] لەگەڵ محی‌الدین بەگی یوزباشیدا حەرەکەتمان کرد • مەفرەزەکە بریتی بوو لە (١) تۆپ ، (٢) مەترەلۆز و چەند تفەنگ و چەند جبە ـ خانەیەك ، ژمارەی سەربازەکانیش پاش ئاوەی بلۆکە عەسکەریەکەی (ئەمریش) التحاقی پێوەکردین گەیشتنە نزیکی سەد سەرباز و چوار پێنج ئەفسەر •

کە گەیشتینە (باش قەڵا) من بەهەلم زانی و لام دا بۆ لای (اسماعیل آغای سمکۆ) و محی الدین بەگیش چوو بۆ نەهری (مەرکەزی شەمزینان ) •

کە ڕووداوەکانم بۆ جەنابی (سمکۆ) گێڕایەوە هەرچەندە پێخۆشماڵی پیشان نەدا لەگەڵ ئەوەدا پێ‌ناخۆش بوونی دەرنەخست • لەم کاتەدا (فارس ئاغا)ی زێبار کە لای (سمکو) پەنابەر بوو بڕیاری دا کە لە ئەنجامی جووڵانەوەکەی ڕەواندزدا ئەویش بگەڕێتەوە زیبار •

---

(١) لەبەشی شەشەمی یادواشتەکەی مامۆستا ڕەفیق حیلمیدا ، کە ئەویش لەزمانی ئەحمەد تەقیەوە ئەیگێڕێتەوە [لاپەڕە ٥٤٩/١٤] نوسراوە کە لە مایسی ١٩٢١دا مەفرزەکە جوولا • لەبەرئەوەی ئەحمەد تەقی خۆی لەوەپێش نووسیویەتی کە لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠دا بەرەو (وان) چوە ، زیاتر ڕێی تێ ئەچێ کە مێژووەکەی ڕەفیق حیلمی ڕاست بێ و لێرەدا ئەحمەد تەقی بەهەڵە ١٩٢٢ ی نووسیبێ هەرچەندە لەمانگەکانیشدا جیاوازی هەر هەیە •

( ج • تەقی )

بەم جۆرە مەگەڵ (فارس ئاغا) و نزیکی (٢٠٠ ـ ٣٠٠) چەکداردا بەرەو نەهری رۆیشتین و لەگەڵ مەفرەزەکەی (محي‌الدین بەگ)دا پێك گەیشتین •

محي‌الدین بەگی قوماندان پێی وتم کە ئەو وای بەباش ئەزانێ من و ئەو ، و (١٤) سەرباز بچینە رەواندز بۆ بینینی ئەهالی و وەزعی ئەوێ ، ئەگەر زانیمان زروف باشە وا هەموو مەفرەزەکەش ئەبەینە ئەوێ • بێگومان من بەمە رازی بووم • فارس ئاغا و سوارەکانی بەرەو بارزان چوون کە لەوێشەوە بچنەوە زێبار • ئێمەش چووین بۆ (کانی رەش) • کە (سعید بەگ)ی سەرەك هۆزی (برادۆست) بەمەی زانی هات بەپیرمانەوە و پاش شەوێك میوانداری بۆ سبەینێ لەگەڵ ئەو ، و هەموو هێزەکەی (برادۆست)دا بەرەو رەواندز کشاین • کە نزیك شار بوونیەوە عەشاماتێکی زۆر هاتن بە پیرمانەوەو پێشوازیەکی باشیان کردین • کە قوماندانی مەفرەزەکە وەزعی بەم جۆرە دی ووتی : « من ئێستا ئەگەڕێمەوە نەهری و لەوێوە داوا لە مەفرەزەکە ئەکەم کە بێن • » کەس بەمە قایل نەبوو ، و هەموو وتیان نابێ بڕۆنەوە و هەر لێرەوە مخابرە بکەن کە موافەقەتی هاتنی مەفرەزەکە وەرگرن • لەدوایدا بڕیار درا کە سەربازەکان لەلای (نوری باوێڵ ئاغا) بمێننەوە و من و قوماندان بچینەوە نەهری و لەوێوە مخابرە بکات بۆ وەرگرتنی موافقتی هاتنی مەفرەزەکە •

ئینجا بزانن ، بێمەعنایی و کردەوەی حاکمە سیاسیەکانی ئینگلیز لەگەڵ دۆست و هاوکارەکانی خۆیاندا گەیشتبوە چی رادەیەك کە وای

ئەو کوردانەی کوردستانی جنوبی کردبێ بەزۆر وا لــە تورك بکــەن
لەشکری خۆیان بنێرن بۆ یارمەتی دانیان لە دەربەڕاندنی ئینگلیزدا ، بــە
رادەیەکی وا کە سەربازەکانی (محی‌الدین) بەگ وەك بارمتە گل‌بدەنەوە
بۆئەوەی ناردنی مەفرەزەکە مسۆگەر بکەن و منیش بکەن بە (مباشر) کە
هەوڵی ئەوە بدەم مەفرەزەکە زوو بگات • دیارە مەفرەزەیەکی سەدکەسی
نرخێکی جەنگی ئەوتۆی یە و گومانی تێدانیە کە هەموو زەحمەتی جەنگ
و بەخێوکردنی شەڕکەران هەر لەسەر ئەهالیەکە خۆی ئەبێ • ئەمەیان
هەر بۆ ئەوە کرد کە خەڵك بزانن گوایا حوکومەتی تورکیان لەپشــتە
و بەمە هانیان بدەن و مەعنەویەتیان بەرز بکەنەوە • ئــەم کارەساتانەش
بۆیە بەم جۆرە خوڵقا کە حاکمە سیاسیەکان بە یارمەتی چەند کەســێکی
خۆپەرست و تەماعکاری وەك بابەکری سەلیم ئاغا و شێخ محمودی ولاش
و خانمی وەسمان پاشا و هەندێکی تر تەشکیلاتی ئیداری شێخ مەحموديان
لەسلێمانی تێك دابوو ، وە هەروەها لــە قەزاکانی موسڵیشدا ئاســوری و
نەستوریەکانیان دژی کوردەکان هان‌ئەدا • هەر ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی
دووبارە کورد هەوڵی گەڕانەوەی ئەو تورکانە بدات کە بەدرێژایی چەند
سەد ساڵێك ئەیان چەوساندنەوە و هیچ مافێکیــان پێ رەوا نەئەبینین •
هەرچەندە ئەشیان زانی کە لە ژێر ســایەی تورکــدا ناتوانن ئاسوودە
بژین لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە ئینگلیزیان پێ باشتربوو ، گومانی تێدانیــە
کە هەستی دینی و « خەلافەت » و « کافرێتی »ش تاڕادەیەکی زۆر کاری
کردبوە سەر خەڵکەکە بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئەم مەبەستە ، واتا بۆ بانگ
کردن و هێنانی لەشکری تورك بۆ رەواندز •

دوازده سەربازەکەمان لەژێر سەرکردەیی نوری باوێل ئاغادا بەجێهێشت و من لەگەڵ قوماندانداا بەرەو نەهری دۆیشتین • خواهەڵناگرێ قوماندان رایۆرتێکی چاکی دا بە قوماندانی لەشکری رۆژهەلات کە بڕیاری ناردنی مەفرەزەکە بدات بۆ رەواندز • لەو کاتەدا کە ئێمە چاوەڕێی وەرامی داواکردنەکەمان ئەکرد فەرمانێك هات کەوا مەفرەزەکەی شەمدنیان دراوە بە قوماندانی لەشکری (جزیره) کە تازە لە دیاربەکر پێك هاتبوو ، وە فەرمان بە (محی‌الدین بەگ) درا کە قوماندانی مەفرەزەکەی بەوەکالەت تەسلیم بە یوزباشی (محمود فاضل) بکات و خۆی ئلتحاق بە لەشکری رۆژهەلات بکات • بەم جۆرە چوونی مەفرەزەکە بۆ رەواندز راوەستا و منیش بە ناچاری لە نەهری مامەوە •

هەموو رۆژێك لە رەواندزەوە نامە و رابەرم بۆ ئەهات کە بۆچی مەفرەزەکە دواکەوتوە و داوایان لێ ئەکردم کە پەلە لە ناردنیدا بکەم • ئەوسا ناچار بووم بچم بۆ (باش قەلا)ی مەرکەزی لیوا • مەسەلەکەم لە (ابراهیم بتلیسي) متصرف گەیاند و کەوتە مخابەرە کردن لەگەڵ ولایەت و مەرکەزدا • پاش چەند رۆژێك تێی گەیاندم کە لەبەر ئەوەی لەشکرەکەی (جزیره) تازە پێك هاتوە ماوەیەکی ئەوێ هەتا بڕیاری ناردنی مەفرەزەکە ئەدەن • لەبەرئەوە پێشیاری کرد کە من بەوەکالەتی قایمقام بچمەوە (نەهری) ، بەمە لە رەواندزیش نزیك ئەبمەوە ، با دوازدە سەربازەکەش لە رەواندز بمێننەوە و هەرکاتێك موافقەت کرا بۆ ناردنی مەفرەزەکە ئەوسا لەگەڵ مەفرەزەکەدا بچین بۆ رەواندز • بەم جۆرە من بە وەکیلی

قایمقامی شەمدنیان ـ هاتمەوە نەهری و (محمود فاضل)یش بە وەکیلی قوماندانی مەفرەزەکە •

لەم کاتەدا هەموو هەفتەیەك دیسان نامـــە و رابەر لـــە رەواندزەوە ئەهات کە خێراشتێك بکەین بە شتێك • پاش ماوەیەك بڕیارەکە هات و لەگەڵ محمود فاضل و مەفرەزەکەدا بەرەو رەوندار جوولایــن • هــەر لە سنووری (کانی رەش)ەوە هەتا(رەواندز) لەلایەن ئەهالیەوە پێشوازیەکی باش کراین و دەستە دەستە ئەهاتن بەپیرمانەوە •

ئا لەم کاتەدا بوو کە بە هان دانی ئینگلیز (شێخ محمدی باڵـەك) و (محمد عەلی ئاغای جندیان) لەگەڵ پیاوەکانیاندا لە جندیان کۆبوونەوە و ئاگاداریان کردین کە ئەوان بە هاتنی مەفرەزەکە رازی نین ، بەڵام پاش هاویشتنی یەك گوللە تۆپ بڵاوەیان لێکرد و ئەوانیش تەسلیم بوون •

کە گەیشتینە رەواندز بەپێی دەستووری ئەوکاتـەی کەمالیەکـــان (ئەنجوومەنی میللی) دروست کرا بۆ ئیدارەکردنی شـار بـــەم جۆرەی خوارەوە :

١ ـ شێخ رەقیب ـ سەرۆکی ئەنجوومەن •

٢ ـ ئەحمەد تەقی ـ نائبی سەرۆکی ئەنجوومەن •

٣ ـ شێخ ئەمین ـ ئەندامی ئەنجوومەن •

٤ ـ شێخ جەوادی سەلان ـ ئەندامی ئەنجوومەن •

٥ ـ غفور خانی سەرچیا ـ ئەندامی ئەنجوومەن •

٦ ـ خدر ئاغای سەرچیا ـ ئەندامی ئەنجوومەن •

٧ ـ ئەحمەد بەگی بگۆگ ـ قائمقامی رەواندز •

٨ ـ نوری باوێل ئاغا ـ قوماندانی ژاندرمە •

٩ ـ شەوکەت ئەفەندی ـ سەرۆکی شارەوانی •

هەروەها تەشکیلاتی هێزی میللیش رێك خرا و چەك و جبەخانەیان بەسەرا دابەش کرا :

خواردەمەنی مەفرەزەکەش لەلایەن ئەهالیەوە ئەدرا • ناوی ئەندامانی (ئەنجوومەنی میلی) و ئەم تەشکیلاتانە پێشکەش بە والی (وان)یش کرا کە بریاری لەسەر بدەن • ئینجا پێویست بوو پەرەبدرێ بە بزووتنەوەکە •

هەتا ئەوکاتە ئینگلیزەکان بەشەست سواری لیڤی کوردەوە و لەژێر فەرماندەیی ئەفسەرێکی کوردا ناوچەی (حـەریر) و (باتاس)یان ئیدارە ئەکرد • بەرێکەوت لەو رۆژەدا کوردێکی ناسراو لەلایەن ئەفسەرەکەوە کوژرابوو ، بەمە دانیشتوان گـــەرم بوون و لە ئەنجامدا ( هێزی میللی ) رەواندز لەژێر ســـەرکردەیی (شێخ جەواد) و (خدر ئاغا)دا دووسـەد تفەنگچیان ناردە سەر قەلای (باتاس) • پاش شەرێکی کەم پەنجا و نۆ سوار بە چەك و وولاخەوە بەدیل گیران و تەنهـا یەکێکیان توانی هەلێ ، هەروەها ئەفسەرەکەشیان گرت • هەرچەندە هـــەولێکی زۆر درا کـە ئەفسەرەکــە بپارێزرێ بەلام بەداخـــەوە لەلایـــەن خوێن ـ گـــری کوژراوەکەوە کوژرایەوە ، و سەربازەکانیش چونکە هەموویان کـورد بوون بەرەلاکران و هەرکەسە چووەوە مالی خۆی •

لەم هەرایەدا تالانی و دەغل و دانێکی زۆری ئینگلیزەکان دەســـت

(هێزی میللی)کەوت • بۆ بەیانی لەگەڵ قوماندانی مەفرەزەکەدا چووینــە (حەریر) و (شێخ رەقیبی بجێل) کرا بە حاکمی ئەوێش •

ئەم ســەرکەوتنــە کارێکی زۆری کردە ســەر دانیشتوانی ئــەو ناوچەیە و راپەڕینەکە پەرەی سەند • (فارس ئاغای زێبار) هاتە (حەریر) بۆ پیرۆزبایی کردنی ئەم سەرکەوتنە • (میرانی قادر بەگ) کە حاکمــی ئینگلیز بوو لە شەقلاوە و بەدزیەوە پەیوەندیمان هــەبوو پاش ئەمە بــە ئاشکرا کەوتە یارمەتی دانی هێزی میللی • شێخ ئەحمــەدی بارزانیش هاتە رەواندز و بۆ بەڵگەی پشتگیری ئــەم جووڵانــەوەیە بیست تفەنگچی لەژێر سەرکردایەتی (شەریف)دا بەجێ هێشت کە تەمسیلی شێخ بکــەن لای (هێزی میللی) • هەروەها (میرانی ئەحمەد بەگی بێتوان) ، (رەشــید بەگی کویڕی) ، (حاجی رەسوڵ ئاغای شــاوڕ) و زۆر کەسی تر لە ئاغاواتی ئەو ناوچەیە پشتی بزووتنەوەکەیان گرت و دەســەڵاتی (هێزی میللی) زیادی کرد •

لەم کاتەدا ( ماجد مصطفی ) و خوالێخۆش بوو ( قالەی ئایشەخان ) لەرێگای ئێرانەوە هاتنە (رەواندز) • ماجد بەنهێنی پێی وتم کە ( توفیق وەهبی)و ( بسحەل ) هاتوونەتەوە سلێمانی بۆئەوەی لەسەر ئیدارەیــەکی کوردي رێك بکەون بەبێ هاتنەوەی شێخ مەحمود ، بەڵام لەبــەرئەوەی کە زوربەی خەڵکی شار داوای گەڕانەوەی شێخ ئەکات جارێ ئەم کارە وەستاوە • منیش عەرزم کرد کە هاتنەوەی شــێخ محمود کارێکی زۆر ئەکاتە سەر رای گشتی ، وە بەبیروڕای من کە ئینگلیز ئــەیەوێ دووبارە

نبداره‌یه‌کی کوردی پێك بهێنێته‌وه ئه‌وه هه‌مووی له‌ئه‌نجامی بزوتنه‌وه‌که‌ی ره‌واندزدایه ، وه من به‌راستی و به‌دڵ له‌گه‌ڵ ئه‌م حه‌ره‌که‌ته‌دام و له‌گه‌ڵی ئه‌مێنمه‌وه ، ئێوه‌ش له‌گه‌ڵ وه‌زعی ئه‌وێ برۆن ، ئه‌گه‌ر ئینگلیز به‌راستی له‌گه‌ڵ کورد هاته‌پێشه‌وه وا هیچ گومانی تێدانیــــه کــــه هه‌موو کوردیان له‌گه‌ڵا ئه‌بێ ..

پاش ئه‌مه له‌گه‌ڵ ماجد و قاله‌ی ئایشه خان و محمود فاضل و شێخ کاکه ئه‌مینی سه‌لان و بیست سه‌ربازو ئه‌فسه‌رێك و شه‌ریفی نوێنه‌ری شێخ ئه‌حمه‌دی بارزان چووین بۆ ماڵی (میرانی ئه‌حمه‌د به‌گ) که ده‌عوه‌تــــی کردبووین • هه‌روه‌ها غفور خانیش گه‌یشته شــــاور • هه‌رله‌م کاتــــه‌دا (ئه‌حمه‌د ئه‌فه‌ندی) ناوێکی پیاوی (کاپیتان کۆك)ی حاکمــــی ده‌ربــــه‌ند ده‌ستی کردبوو به سزادانی ئه‌هالیه‌که‌ی شاور ، کــــه‌مێکیش لــــه‌وه‌پێش (کاپیتان کۆك) به‌ده‌ستی خۆی و به شــێوه‌یه‌کی ناشــیرین و به‌ئاشــکرا له‌رانیــــه (فه‌تاح به‌گ)ی کوشتبوو • ئه‌مانــــه هــــه‌مووی بوونه هۆی ئه‌وه‌ی ئاژاوه‌بکه وێته‌وه • خه‌ڵکه‌که هێرشیان برده ســــه‌ر (ئه‌حمــــه‌د ئه‌فه‌ندی)یه‌که و گرتیان و ره‌وانه‌ی ره‌واندزیان کرد ، و اله‌به‌ر ئــــه‌وه‌ی به پیاوێکی خراپ به‌ناوبانگ بوو له‌رێگا دوو به‌رزانی کوشتیان •

که گه‌یشتینه (شاور) دانیشتوانی (ئاکۆی به‌رده‌ر) هه‌ر له‌خۆیانــه‌وه هێرشیان برده سه‌ر (رانیه) ، ئێمه‌ش به‌ناچای چوونیه (سه‌رکه‌پکان) و له شه‌ری (رانیه)دا به‌شداریمان کرد •

حاکمی سیاسی (ده‌ربه‌ند) و (بابه‌کر ئاغا) له قه‌ڵای رانیه‌دا سپێریان

بەستبوو ، وە بەرگریەکی بەهێزیان ئەکرد ، لەهەمموو لایەکەوە هێرش برا ، بەرادەیەکی وا کە (ماجد مصطفی) ئۆتۆماتیکێکی وەرگرت و هەتا سەر قولەی رانیە هێرشی برد ، بەڵام ئۆتۆماتیکەکەی پەکی کەوت و بەزەحمەت بۆمان رزگار کرا و هاتەوە لای خۆمان •

لەبەر ئەوەی کە ئێمە لەراستیدا بۆ شەڕی (رانیە) نەهاتبووین و خۆمان بۆ ئامادە نەکردبوو ، وە شەڕەکە بووبوو بە تووشمانەوە ، وە لەبەر ئەوەی بەبێ گرتنی دەربەند گرتنی رانیە هیچ کەڵکی نەئەبوو ، وە بۆ ئەوەی تووشی هێرشێکی (عەکسی) نەبین ناچار (رانیە)مان بەجێ هێشت و گەڕاینەوە (رەواندز) • حاکمی سیاسی و بابەکر ئاغا بەمەوە نەوەستان و هێرشیان بردە سەر (ئاکۆ) و (شاور) ، بەڵام خەڵکەکە بەرگریەکی باشیان کرد و کشانەوە بۆ شاخەکان ، لەئەنجامدا لەشکری حاکمی سیاسی و بابەکر ئاغا پاش دوو رۆژ بڵاوەیان لێ کرد • بەم جۆرە ناوچەی شاور کەوتە ژێر دەستی ئێمەوە • ماجد مصطفی و قالەی ئایشە خانیش نامەی (توصیە)یان لێ وەرگرتم بۆ والی (وان) و پاش بینینی گەڕابوونەوە سلێمانی و ئیتر دەنگ و باسم لێ وەرنەگرتن •

پاش ئەمە (محی‌الدین بەگ)ی قوماندان گەڕایەوە رەواندز ، و (محمود فاضل) نەقڵ کرایەوە • هەروەها مەفرەزەکەی رەواندز بە سەد سەرباز و چەند ئەفسەر و تۆپێك و چەك و جبەخانەی تر بەهێز کرا •

هەتا ئەم کاتە ئینگلیزەکان لەچەند فڕۆکەیەك بەولاوە هیچی تریان

بەکار نەئەهێنا ، بەڵام (شێخ رەقیبی) حاکمی (حەریر) ئاگاداری کردین کە ئینگلیز نیازی وایە لە دوولاوە پەلاماربدات لەبەر ئەوە پێویستە لەشکرەکەی خەریك بکەین ، بۆیە من و (محی‌الدین بەگ) و چەند سەربازێك لەگەڵ هێزی (شێخ کاکە ئەمینی سەلان) و (خدر ئاغای سەرچیا) چووینە حەریر • لەوێ بۆمان ئاشکرا بوو کە ئینگلیز لە (عەقرە)وە نزیکی چوار سەد سەربازی نەستوری و ئاسوری هێناوەتە سەر زێی بادینان ، واتا زێی گەورە ، هەروەها نزیکی هەزار و پێنج سەد سەربازی لیڤیشیان گەیاندۆتە شەقلاوە کە لە هەردوو قۆڵەوە پەلاماری (حەریر) و (باتاس) بدەن • ئێمە بەو هێزەی کە هەمان بوو (حەریر) و (باتاس) مان قایم کرد و چاوەرێی هێرشی ئینگلیزمان کرد[۲] • لەنەبەقدا هەردوو لەشکرەکەی ئینگلیز دەستیان کرد بە جووڵاندن و کە گەیشتنە دەشتەکانی (حەریر) ئیتر فرۆکەکانیان بەبێ بڕانەوە لەهەولێر و موسڵەوە بۆ پارێزگاری هێزەکەیان و بۆبڵاوە پێکردنی هێزەکەی ئێمە کەوتنە چەرخەکردن • شەڕ بەتەواوی دەستی پێ

---

(۲) سەیر ئەوەیە کە ئەحمەد تەقی هەمان هەڵەی سوپایی دووبارە کردەوە کە خۆی لەشەڕەکەی (دەربەندی بازیان)دا رەخنەی لە سەرکردایەتی شێخ مەحمودگرت کەلەوێ چاوەڕێی هێرشی ئینگلیزی ئەکرد و خۆی دەست پێشکەری نەکرد لە هێرش بردندا • هەرچەندە ناوچەکەی (باتاس) لە (بازیان) جیاوازبوو ، وەلێرەدا شاخەکانی (حەریر)هەبوە کە لەکانی تەنگانەدا بۆی بکشێنەوە بەپێچەوانەی بازیانەوەکە شوێنی کشانەوەی نەبو •

• ج•ت •

نەکردبوو هەتا گەیشتنە بەردەمی (باتاس)و حەریر ، ئەوسا لەشکری ئێمە دەستی کردەوە و تەقەی دەست پێکردو کەوتە بەرگری کردن ، ئەوانیش بە پارێزگاری فرۆکەکانیانەوە کەوتنە پەلاماردانی ئێمە و هەتانیوەرۆ شەڕێکی خوێنین دەوامی کرد •

فرۆکەکانیان زۆر کاریان ئەکردە سەر سەنگەرەکانمان لەبەرئەوە ناچار بووین (باتاس)مان بەجێهێشت و بەرەو (حەریر) کشاین • لەم کاتەدا هێزی ئینگلیزی جەبهەی عەقرە باتاسی گرت و لەگەڵ هێزەکەی شەقلاوە یەکیان گرت و پێکەوە بەرەو حەریر کشان • لەشکری ئێمە بەرگریەکی باشی کرد ، بەڵام کە تاریك داهات زیاتر لەنیوەی (حەریر) کەوتبوە ژێردەستی دوژمنەوە ، و نیوەکەی تریشی کە پاڵی دابوو بە شاخەکەوە بەدەست ئێمەوە مابوەوە •

کەشەو داهات و تەقە وەستا کەوتینە تەرتیبات کردن کە لەرێگای (سیپلك)ەوە لە شەبەقدا بکەوینە گوللە بارانی باتاس و هەر هێزێکمان هەیەلە شاخەکانەوە ئەوانیش هێرشی بەرنەر سەر • بەم جۆرە لە بەرەبەیاندا بەپێی ئەو تەگبیرە جوولاین • ئەو هێزە مەزنەي ئینگلیز سەری لێشێوا و لە رێگای شەقلاوەوە کەوتنە کشانەوە و هەتا نزیکی ( باڵسیان ) راومان نان •

لەم شەڕەدا لەشکری ئینگلیز زیانێکی زۆری لێکەوت و چەك و جبەخانەیەکی باشمان دەسگیر بوو • پاش یەك دوو رۆژ لەگەڵ مەفرەزەکەدا گەڕاینەوە رەواندز و شێخ رەقیب لە ( حەریر ) مایەوە • پاش ئەمە دەسەڵاتی ( هێزی میللی ) هەتا ئەهات پەرەی ئەسەند و لە هەموولایەکەوە ئەتەنیەوە •

# گەڕانەوەی شێخ مەحمود و پەیوەندی لەگەڵ (ئۆزدەمیر)دا

لەوکاتەدا کە ئێمە خەریکی ئەم شـــەڕانە بووین حوکومەتـــی فەرەنســـە لەجەبهەی ( جزیرە ) دا لەگەڵ تورکـــدا رێك کەوتبوو ، و ( ئەدەنە ) و ناوچەکەی دەوروپشتی تەسلیم تورکیا کردبوو ، هەروەها پارمە تیەکی زۆری تریشی دابوو •

یەکێك لەو ئەفسەرە تورکیانەی کە لە جەبهەی ( عەینتاب ) لە دژی فەرەنسیەکان ئەجەنگا میرئالآیی ( کۆلۆنێل ) عەلی شەفیق بەگ بوو کەبە ( ئۆزدەمیر ) بەناوبانگ بوو ، وە لەکاتی خۆیدا روتبەی قایمقامی فەخری وەرگرتبوو • کە شەڕی نێوانی تورك و فەرەنسە بڕایەوە ئیتر ئەویش لەو ناوچانەدا کاری نەما و لەبەر ئەوە بەخۆی و هێزەکمیەوە کە زوربەیـــان کوردی کەرکوك و هەولێر بوون نێررایە ( رەواندز ) و بوو بە قوماندانی هەموو هێزەکەی ئەوێ و ( محی‌الدین بەگ ) نەقڵ کرا •

ئۆزدەمیر ، کە بە رەگەز لە چەرکەسـەکانی ( میسـر ) بـوو ، پیاوێکی چالاك و زیرەك و خوێندەوارێکی باش بوو ، شارەزاییەکـــی تەواوی لە رەوشت و خووی کوردەکاندا هەبوو ، و لە دەســـتووری عەشایری چاك ئەزانی • قسە خۆش وقسەزان و ووریابوو • زۆر ئاقڵتر لەگەڵ سەرەك هۆزە کوردەکاندا ئەجوولآیە و بۆیە ، بەپێچەوانـــەی حاکمە ئینگلیزەکان ، هەموویانی کردبوو بە ئەمووستیلە و کردبوونیـــە

پەنجەی خۆی • ئەو ئاغایانەی کە لەوەپێش لەگەڵ بابەکر ئاغادا ساردی کەوتبوە نێوانەوە زوربەیان خۆیان هاتن بۆ بەخێر هاتن کردنی یان بە نامە ناردن دۆستایەتی خۆیان پیشان دا • زۆری پێ نەچوو ئاغاکانی پشدەر و رانیە داوایان کرد کە دەربەند بگرن و بڕای بڕای حوکمی ئینگلیز لەو ناوچەیەدا لەناوبەرن و هێزی بابەکر ئاغا وشێخانی بجێل بشکێنن و داواشیان کرد کە ( عەقرە ) بگرن • هەر لەم کاتەشدا بوو کە ( کەریم بەگی هەمەوەند ) و ( فەقێ محمد ) و ( سید محمدی جباری ) بەخۆیان و دووسەد سوارەوە لەرێگای دەشتی حەریرەوە هاتنە رەواندز • ئەمەش زیاتر بوو بەهۆی ئەوەی کە زووتر هێرشەکەی دەربەند دەست پێبکرێ•

پاش دوو رۆژ بە دوو قۆڵ ، واتا لە رێگای شاورەوە بۆ رانیە و لە رێگای ناودەشتەوە بۆ دەربەند حەرەکەت کرا : من لەگەڵ هەمەوەندەکاندا لە قۆلی شاور و ئۆزدەمیر لە قۆڵی ناودەشت •

هێزەکەی ئیمە بە ئاسانی چوە شاور و ئاکۆوە بەڵام هێزەکەی ( ئۆزدەمیر ) لەگەڵ هێزی ( بەهلول ئاغای ئاکۆ ) کە مدیری ئینگلیزەکان بوو تووشی شەڕ بوو •

من لەگەڵ سەد تفەنگچی شێخی سەڵاندا چووم بۆ یارمەتی دانی ئۆزدەمیر • دوژمنەکانمان شکاند و رزگارمان کرد • دوای ئەمە لە رەواندزەوە هێزی ترمان بۆهات و ئیمەش دەستمان کرد بە جووڵاندن بەرەو ( شەهیدان ) کە دوو سەعات لە دەربەندەوە دوورە وگرتمان • ئینگلیزەکان رانیەشیان چۆڵ کرد و ئیمەی تێ چووین•هێزی هەمەوەندیش بەبێ راوەستان لەرێگای ( سیوکە ) وە هەتا ( بازیان ) چوون •

ئینگلیزەکان هێزێکی زۆریان هێنابوە دەربەند و بڕیاری پاراستنیان دابوو ، هەروەها ( بابەکر ئاغا ) ش لە قەڵادزە خۆی ئامادە کردبوو کە بباریزێ • بەڵام ( هێزی میللی ) ئەوەندە زۆربوو کە نەیانتوانی بەرگەبگرن • هەر لە ( بارزانەوە هەتا سنووری ( ماوەت ) شەڕبوو • بابەکر ئاغا لە قەڵادزە گەمارۆ درابوو ، هێلی تەلەفونی دەربەند و قەڵادزە لە کار خرابو وهەرچەند فرۆکەکانیشیان بەشداری لەشەڕدا ئەکرد بەڵام کەڵکێکی ئەوتۆی نەبوو • هەردوو لووتکەکانی شاخی دەربەند لە لایەن هێزی ( هەباس ئاغا ) و ( غفور خان ) ەوە گیرابوو ، هێزی ئەهالیش لە ( شەهیدان ) خۆیان ئامادە کردبوو ، و بەرامبەر دەربەند وەستابوون ، هەروەها هێزی ئەهالی رانیەش لەسەرپێبوون •

ئینگلیز بەناچاری بڕیاری چۆڵ کردنی دەربەندی دا و کشایەوە • کە بەرەبەیان هێرشمان بردە سەر دەربەند بەبێ شەڕ گرتمان چونکە ئینگلیزی تێدا نەمابوو • (هێزی میللی) دووی هێزە راکردوەکەی ئینگلیز کەوت و لە قەڵای (بۆسکێن)دا کە خۆیان مات دابوو شکێنران و بەرەو شاخی (دەروبزماری) رانیە راونران کە لەوێ خۆیان بگرنەوە بەڵام پێش ئەوەی بگەنە ئەوێ سوارەکانی (هێزی میللی) رانیە پەلاماری دا و شاخەکەیان گرت • کە ئینگلیزەکان ویستیان خۆیان بگەیەننە لای (گردە بلویر) سوارەکانی پشدەر پێش ئەوان ئەویشیان گرت • ئیتر ئینگلیزەکان تەواو شپرزە بوون و لە هیچ لایەکەوە رێگایان نەما • ناچار بە پەرێشانی خۆیان گەیاندە (بیتوێن) و هەموو چەك و جبەخانەیان بەجێ هێشت و لەژێر پارێزگاری فرۆکەدا بە هەزار شەرەشەق خۆیان

گەیاندە (سەرخومە) و چوونە کۆیەوە ، بو سبەینێ ئەوێشیان بەجێ هێشت ، پاش ئەمە هێزی ئینگلیز سلێمانیشی چۆڵ کرد •

هەر لەم کاتەشدا بوو کە ئیعلانی گەڕاندنەوەی شێخ مەحمودیان بۆ سلێمانی کرد !

پاش دوو رۆژ لە کۆیەوە وەفدێک هات بۆلامان و بەزۆر مەفرەزەیەکی چل عەسکەری تورکیان پێ ناردینە ئەوێ • کە ئینگلیز کۆیەی بۆردومان کرد ئەهالیەکەی پەشیمان بوونەوە لەوەی کە ئەو مەفرەزەیەیان بردە ئەوێ ، و لەبەر پاراستنی ئەهلی شار کێشامانەوە بۆ(خەڕان) • پاش ئەمە وەفدێکی سلیمانی هات کە هێزێك بنێرینە ئەوێ بەڵام نەوەك کارەساتەکەی کۆیە دووبارە بێتەوە و سلێمانیش تووشی بۆردومان کردن ببێ رەتمان کردەوە و تەنها بەوە رازی بووین کە هێزێکی پشدەر لەگەڵ چەند عەسکەرێکدا بەمۆقەت بنێرینە (قەمچووغە) •

پاش ئەمە لە قەزای رانیە و پشدەر تەشکیلات کرا ، چونکە بابەکر ئاغا پاش گرتنی دەربەند بێ شەڕ قەلادزێی بەجێ هێشتبوو ، و دەستەی هەباس ئاغا ئەوێیان گرتبوو بایز ئاغا بووبوو بە قایمقامی قەلادزە و شێخ ئەمینی سندۆڵان بە قایمقامی رانیە • رەمزی بەگ ناوێك سەرۆکی مەفرەزەیەك و ئاغایەکی پشدەر بوون بەمەئموری دەربەند ( فوزی بەگی یوزباشی ) بوو بە قوماندانی رانیە و پشدەر نیش بووم بە ( مفتشی ئیداری ) هەردوو قەزاکە کە مەرکەزەکەیان رانیە بوو •

ئۆزدەمیر گەڕایەوە رەواندز و ( هێزی میللیش ) هەر کەسە بۆ

جێگای خۆی بڵاوەی لێ کرد و تەنها خۆمان و عەسکەرەکان و غفور خان لەگەڵ هەندێ پیاوی لەرانیە ، غفور خانی مدیری ناودەشت ، و قادر ئاغای مصطفی ئاغای پشدەری مدیری (مەرگە)ماینەوە • فەعالیەتی ئینگلیزەکانیش تەنها مابوەوە سەر فرۆکەکانیان و هیچی تر •

لەم کاتەدا دووبارە وەفدێکی سلێمانی هات و داوایان کرد کە بچینەسەر سلێمانی بەڵام تێمان گەیاندن کە ئێستا چوونە سلیمانیمان مەعقول نیە و پێویستە چاوەڕێی گەڕانەوەی شێخ مەحمود بکەین و باش نیە بزووتنەوەکەمان زۆر پەرە پێ بدەین و بڵاوی بکەینەوە نەك تووشی [ عکس العملیة ] بین • بەم جۆرە دووبارە داواکاریەکەی سلیمانیمان رەت کردەوە •

دیارە ئینگلیزەکانیش زۆر چاك ئەمەیان ئەزانی و بۆیە لەترسی ئەوەی کە نەك ناچار بین سلیمانیش بگرین بەپەلەپرووزێ شێخ مەحمودیان هێنایەوە و دووبارە بوەوە بە حوکمداری سلێمانی •

کە شێخ گەیشتەوە سلێمانی بۆئەوەی پیشانی بدەین کە هەر لەگەڵیداین هێزەکەی (قەمچووغە)مان هێنایەوە رانیە لەپاشدا لەگەڵ (هەباس ئاغا)دا بەنهێنی گفت و گۆیەکمان کرد و من پێشنیارم کرد کە ئەو (بابەکر ئاغا) ئاشت بکاتەوە و بەیەکەوە بچنە خزمەت شێخ مەحمود بۆ بەخێر هاتنەوە کردنی • بەم جۆرە هەردوو ئاغای کۆنە دوژمن لەگەڵ پیاوانی خۆیاندا چوون بۆ خزمەتی شێخ • لەگەڕانەوەیاندا هەباس ئاغا هاتە رانیە بۆلام و پێی وتم کە ئەمجارە لەسلێمانی کەپیتان (چەکمەن)ی

دیوەو پێی وتوە کە ئەم کارەساتانەی رووی داوە هەمووی لەچاوی ئینگلیز و کردەوە ناڕەواکانی مێجەر سۆن و حاکمە ئینگلیزەکانەوە بوە • (چەکمەن) پێی وتبوو : « وا هەموو شتێك براوەتەوە ، ئێستا تورکەکان لە(رەواندز) دەرکەین • » هەباس ئاغا وەرامی دابوەوە : « ئێمە خۆمان لەئەنجامی پیاوخراپی ئێوە لەگەڵ شێخ مەحمودا تورکەکانمان هێناوە ئێستا چۆن لایان ئەبەین • بەڵام ئەگەر کردەوەکانتان باش بکەن و بەراستی ئیدارەی کوردستان بدەنە دەست شێخ مەحمود وا ئێمەش ئەوسا تورکەکان دەرئەکەین ، ئەگینا پەیوەندیان لەگەڵدا بەهێزتر ئەکەین ••

پاش ئەمە (چەکمەن) و (هەباس ئاغا) رێك کەوتبوون کە ئێمە رانیە بدەینە دەست ئیدارەی شێخ مەحمود و هەوڵ بدرێ کۆیەشی بخرێتە سەر •

چاوم بە فەوزی بەگی فوماندان کەوت و تێم گەیاند کە ئێستا پاش هاتنەوەی شێخ مەحمود باشتروایە قەزای (پشدەر) و (رانیە) تەسلیم بە ئیدارەی ئەو بکرێ ، هەروەها بۆباری سیاسی و عەسکەریمان قازانجێکی باشی ئەبێ ئەگەر هەموو مەفرەزەکەی رانیە و دەربەند بگوێزینەوە بۆ (بێتواتە)و قایمقام و هێزی پۆلیسی شێخ مەحمود بهێنینە رانیە چونکە ئێستا وەزعی مەفرەزەکە لاوازە • فەوزی بەگی « مەفرەزە قوماندانی پێشنیارەکەی بەدڵ بوو ، وە یەکسەر چوو بۆ رەواندز کە بیروڕای (ئۆزدەمیر)یش تێ بگا و رازی بکات • پاش چەند رۆژێك گەڕایەوە و ئاگاداری کردین کە (ئۆزدەمیر) رازی بوە بەڵام بەو مەرجەی یەکێکی

سەربەئیمە بکرێ بە قایمقامی رانیە کە شێخ مەحمودیش بتمانەی پێ بکات ـ بۆ ئەمەش (سید عبدالله) پێشنیار کرا •

مژدەم دا بە هەباس ئاغا کە کارەکەمان سەری گرتوە و(رانیە) چۆڵ ئەکەین و تەسلیمی شێخ محمودی ئەکەین ، ئەویش بەدڵخۆشیەوە سلێمانی لەمە ئاگادارکرد • پاش ماوەیەك (سید عبدالله) بەخۆی و دەسەودایەرەیەوە و بە ئاڵای کوردستانەوە گەیشتە(رانیە) و بەناوی حوکومداری کوردستانەوە دەستی کرد بە ئیدارە کردنی • چەند پیاوێکی سەر بە ئینگلیزیشی لەگەڵا نێردرابوو !

زۆری پێ نەچوو دووبارە کردەوە ناپەواکانی ئینگلیز سەری دەرهێنایەوە • کە وەفدی شێخ داوای کرد کۆیە بخرێتە ژێر دەسەڵاتی حوکمداری کوردستانەوە ـ بەپێی رێك کەوتنەکەی هەباس ئاغا و چەکمەن ـ ئینگلیزەکان ئەمەیان رەت کردەوە ، و دیسان هەوڵیان دا کەدڵسۆزانی شێخ لەیەك بکەن •

ئێمە لەراستیدا لە سیاسەتدا کۆڵ بووین و تەواو نەبووین ، هەروەها جەنابی شێخ محمود و دەوروپشتەکەشی • لەبەرئەوەش کە لە کردەوەکانی ینگلیز تەواو زویربووبوو ، و بڕوای پێیان نەمابوو دەستی کرد بە مخابەرە کردن لەگەڵ ئۆزدەمیردا کە لەسەر ئیدارەیەکی تایبەتی و هاوبەشی ، رێك کەون • ئۆزدەمیر وەرامی دایەوە کە ئەمە لە سەلاحیەتی ئەودا نیە و پێویستە یەکسەر لەگەڵ(ئەنقەرە)دا قسەبکات • شێخ محمود نەیتوانی چاوەڕێ بکات و داوای لە ئۆزدەمیر کرد کە

وەفدێك بنێرێ بۆ سلێمانی بۆ گفتوگۆکردن • ئۆزدەمیر (فەوزی بەگی)یوزباشی و (رەمزی بەگی)کۆنە قایمقام و منی ناردە لای جەنابی شێخ •

راسپاردەی ئۆزدەمیر تەنها ئەوە بوو کە سەرکردەی هێزەکانی رواندز هەستی بەرامبەر شێخ محمود زۆر باشە و بەهەموو چەشنە ئیدارەیەك رازین کە لەنێوان کورد و تورکدا پێك بێت ، بەڵام ئەم بڕیارە ئەبێ لەلایەن حوکومەتی مەرکەزیەوە بدرێ[1] •

هەرچەندە ئێمە بە دزیەوە گەیشتبووینە سلێمانی بەڵام ئینگلیزەکان ھەمەیان زانی لەگەڵ ئەوەشدا گوێیان لێ خەفاند •

عەرزی شێخم کرد کە لە پەیوەندی بەستندا لەگەڵ تورکدا نەختێك بەلەیان کردوە • بۆم دەرکەوت کە (سمکۆ)لەمەدا دەورێکی گەورەی هەبوە و ئەو داوای لە شێخ مەحمود کردبوو کە زوو داوای وەفدەکەی ئۆزدەمیر بکات •

لەجەنابی شێخم گەیاند کە رێك کەوتن لەگەڵ تورکدا بۆ سەربەخۆیی

---

(١) مامۆستا رەفیق حیلمی لەزۆر جێگای یادداشتەکەیدا ، بەتایبەتی بەشی (٦) لاپەرە ٨٤/٦١٤دا وای دەر ئەخات کە ئەحمەد تەقی و فەوزی بەگ و رەمزی بەگ بێجگە لەو راسپاردانەی باس کران ئەو نامەیەی ئۆزدە میریشیان دابوو بە شێخ مەحمود کە مەرجەکانی خۆی تێدا دەرخستبوو بۆ یارمەتی دانی کوردەکان ، بەڵام ئەحمەد تەقی لەهیچ جێگایەکی یادداشتەکانی خۆیدا ئەم قسانە ناسەلمێنێ •

« ج • تەقی »

کوردستان زەحمەتە بەڵام ئەمە ئەگەر بشکرێ ئەبێ حوکومەتی مەرکەزی بڕیار بدات و تۆزدەمیر هیچی بەدەست نیە .

لەم کاتـــەدا (سمکۆ) لەگــەڵ ئینگلیزدا ناڕێك بوو ، و لەگـــەڵ (سید طه)شدا کەوتبوە شەڕەوە ، و پاش هێرش بردنێکی ناخافلی تورکەکان بۆ سەر بارەگاکەی خێزانەکەی کوژرابوو ، و خەسرەوی کوڕی بەدیـــل گیرابوو ، و دە هەزار لیرەیەکـــی ئاڵتوونیشی لێ زەوت کرابـــوو بۆیـــە ئەیویست لەگەڵ تورکدا رێك بکەوێ . کە لە سمکۆم پرسی بۆچی لەگەڵ ئینگلیزدا رێك نەکەوت ووتی : « ئینگلیز درۆ ئەکات و لـەگــەڵ کوردا نیەتی باش نیە و هــەرچی بەڵێنێکیش بدات هــەمووی فڕوفێڵـــە و بۆ خەڵەتاندنە . لەبەر ئەوە بڕیارم داوە کە بەقسەی تورك بکـــەم و بچمەوە سەر سنووری ووڵاتی خۆم و چاوەڕێی هەلێك بکەم ، بەڵکو خەسرەویشم دەست بکەوێتەوە . »

کە شێخ لەگەڵ وەفدەکەدا نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك بڕیار درا کـــە وەفدێك بچێتە ئەنقەرە بۆ ئەم مەبەستە و لەسەر ئیدارەیەکی هاوبەشی کورد و تورك بەسەرۆکایەتی شێخ محمود پێك بێن . بـەم جۆرە شـێخ محمود (فتاح بەگ)ی ژن برای و (رەفیق حیلمی)و منی نارد بۆ ئـــەم مەبەستە . چووشینە رەواندز و ئەمەمان لە تۆزدەمیر گەیاند . ئەویش فەوزی بەگی یوزباشی بە ناوی مەفرەزەکەوە لەگەڵدا ناردین . هەروەها من راسێردرام کە بێجگە لەمەش لابدەمە مەرکەزی جەبهەی رۆژهەڵات لە (سەری قامیش) بۆ کارەکەی اسماعیل ئاغا و خەسـرەوی کوڕی . لـــەبەرئەوەی کۆتایی

زستان و سەرەتای بەهار بوو لە شەمدینانەوە ڕێگا بۆ تورکیا بەستـرابوو ، بۆیە بڕیارمان دا کە بچینە تەوریز و بەرەزای رووسەکان ـ کە ئەوسـا دۆستی تورکیا بوون ـ لە باتۆمیەوە بچینە تورکیا ۰ بەم جۆرە هەموو لـە رەواندزەوە و لە ڕێگای (زینۆی شێخ)ەوە حەرەکەتمـان کـرد ۰ پاش چەرمەسەرەیەکی زۆر گـەیشتینە (تەورین) و لە قۆنسـولخانەی تورك دابەزین و پاش چەند هەفتەیەك ڕێگامان درا بڕۆین ۰ کە گەیشتینە سنووری تورکیا من و فەوزی بەگ لامـان دا بۆ(قارس) و (سـەری قامیش) بۆ بینینی قوماندانی جەبهەی رۆژهـەلات و مەسئەلەکـەی (سـمکۆ) و خەسرەوی کوڕی ۰ رەفیق حیلمی بەگ و فتاح بەگ چوونە (باتومی) کە لەوێشەوە بچنە ئەنقەرە و ئەستەمولّ ۰

کە گەیشتینە (سەری قامیش ) فەریق (علي سعید پاشا)مان بینی کـە وەکیلی (کاظم قەرە) پاشابوو ۰ بۆ سبەینێ ناردی بەشوێنمدا لە دائـرەی رەسمی خۆیدا ، و ناردی خەسرەوی ئیسماعیل ئاغایان هێنا ۰ خەسرەو تەمەنی (١٠ـ١٢) سـالّ ئەبوو ، دەستێك جلی ئەرکانی حـەربی لـە بەردابوو ، وە ئەفسەرێکی بەدواوە بوو ۰ ئەوقـەم لەگـەلّدا کـرد و هەوالّیم پرسی ۰ خەسرەو بەتورکی قسەی ئەکرد ۰ علي سعید پاشا ووتی : « من و خێزانم منداڵمان نیە ، وخەسرەومان کردوە بـە کوڕی خۆمان و ئێستا پێی ئەخوێنم ، باشتر وایە لای خۆم بمێنێتەوە ۰ »

منیش عەرزم کرد : « ئیسماعیل ئاغا مەراقی بۆ ئەخوات ، باشـتر وایە جارێ بینێرنـەوە لای باوکی و ئەوسـا خۆی بینێرێتەوە لاتان بۆ خوێندن ۰ » وەڕامی دایەوە : « ئێستا ئیسماعیل ئاغا هاتۆنـەوە سـەر

سنووری ئێمە و رازی بوە کە بەخۆی و هاوکارەکانیەوە لەوێدا دابنیشێ •
منیش خەریکی تەرتیبات کردنم لەگەڵ مەرکەزدا کە خەسرەوی بدەینەوە،
هەروەها پارەکەشی لامان پارێزراوە و ئەیدەینـــەوە ، بەڵام باکـــەمێك
چاوەڕوان بکات • ، تکام لێ کرد کە بەهۆی والی وانەوە ئەم بڕیارە بـــە
ئسماعیل ئاغا بگەیەنێ و سوپاسم کرد •

ئینجا کەوتینە باسی گرنگتر •

هەتا ئەو کاتە حوکومەتی تورکیا بەرەسمی ئیعترافی بە هێزەکـەی
رەواندز نەکردبوو کە هێزی تورکیایە ، چونکە (ئوزدەمیر) پەیوەنـــدی
لەگەڵ حوکومەتی مەرکەزیدا باش نەبوو ، وە هەتا ئەوکاتە بەهێزێکـــی
هەرانێرەرەوە و چەتەگەری تەماشا ئەکرا • داوام لە علی سعید پاشا کرد کە
بەتەواوی هەڵوێستی خۆیان دەربارەی ئەمە روون بکەنەوە • فەرمووی
کە لەم دواییەدا حوکومەتی مەرکەزی بڕیاری داوە لەمەودوا هێزەکـەی
رەواندز بە لەشکرێکی رەسمی تورکی دابنێ و هەر هێرشێکی بکرێتـــە
سەر بەهێرشی سەر لەشکری تورکیا اعتبـار بکرێ • هەروەها بڕیاریش
دراوە کە لوایەکی سێ تابووری تەواو بەهەموو چەکێکەوە لە قارسەوە
بنێرێتە وان و لەوێشـــەوە بۆ رەواندز و میر ئالایی (سلێمـان صبری)ش
کراوە بە قوماندانی هەموو هێزی رەواندز • هـــەرکاتێك ئـــەم لیوایـە
گەیشتە رەواندز ئەوســـا حوکومەتی تورکیا بەرەسمی بڵاوی ئەکاتـەوە
کە لەشکرەکەی رەواندز لەشکری تورکیایە • بەم جۆرە کە لەشـــکری
رەواندز بەهێزتر کرا ئەوسا توانای یارمەتی‌دانی شێخ محمود زیـاتر
ئەبێ • وە لەدوایدا فەرمووی : « من شێخ محمودم خۆش ئەوێ و ئـەو

شایەعانەی کــە گوایا لەکــارەساتەکــەی موصلدا من دەســتم هەبوە هەمووی درۆیە ••

بۆسبەینێ پێکەوە لەگەڵ میرئالاّیی (سلیمان صبری) چوینە (قارس) بۆ چاوپێ کــەوتن و ناردنی لیواکە • سێ تابوور بە هــەموو کــەلوپەل و پێویستیەکەوە ئامادە کرابوو بۆ ئەوەی بەرەو (وان) بجووڵێن•دیارە چوونی ئەم لەشکرە بۆ وان لەدە رۆژی زیاتر ئەوێ چونکە ئەوسا هێشتا رێگــای شەمەندەفەر و ئوتومۆبیل نــەنێوانی قارس و واندا نــەبوو • من لــە (سەری قامیش)مامەوە هەتا لیواکە گەیشتە (وان) •

ئەم دەنگ‌وباسە بە ئینگلیزەکان گەیشــتبوەوە بۆیە بەپەلە هێــزی خۆیان کۆکردبوەوە و پەلاماری رەواندزیان دابوو ، ئۆزدەمیریان شکاندبوو، و بەرەو ئێران تەرەیان کردبوو • هەروەها بەهاندانی ئینگلیز ( سید طه ) و هاورێکانیشی هێرشیان بردبوە سەر ( نەهری ) و گرتبوویان • کە هێزی سلێمان صبری بەگ ئەگاتە ( گەور ) وباسی راکردنی ئۆزدەمیر ئەزانــێ هێرش ئەباتە سەر سید طه و ئەیشکێنێ و شەمدینان ئەگرێتەوە و واز لــە چوونە رەوانــدز ئەهێنێ • تابوورێك ســەرباز لــە (نەهری) بەجــێ ئەهێڵێ وخۆی ئەگەڕێتــەوە • بەم جۆرە تورکیا بەرەســمی دان‌پیانانی لەشکری رەواندز بەلەشکری تورکیا دوا ئەخات •

پاش چەند رۆژێك علــي سعید پاشــا ئەم هەوالاّنەی بە‌نەفەتەوە بۆگێڕامەوە ، زۆریش سەرزەنشتی ئۆزدەمیری کرد کە خۆی نەگرتــوە هەتا لەشکرەکەی ئەگاتێ •

پاش ئەمە رازی بوو کە لە تەرابزوونەوە بچم بۆ ئەنقەرە •

## چوونم بۆ ئەنقەرە و بیروڕای کوردەکانی ئەوێ

کە گەیشتمە ئەنقەرە (فتاح بەگ) ئاگاداری کردم کە رەفیق حیلمی بەگ لەرێگای دیاربەکرەوە گەڕاوەتەوە سلێمانی •

بۆ سبەینێ چووم بۆ بینینی ( حسین بەگی رؤوف بەگ ) ی سەرەك وەزیران و وەکیلی وەزیری دەرەوە • فەرمووی کە ( رفیق حلمي ) خۆی پێ نەگیراوە و گەڕاوەتەوە سلێمانی • وەفەرمووشی : « ئیستا عصمت پاشا لە لۆزانە و لە ئەنجوومەنی میللەتاندا داوای ولایەتی موصل ئەکاتەوە • لەبەرئەوە پێویستە چاوەڕێ ئەنجامی ئەمە بکەن • هەموو رۆژیکیش چاوتان بە ( محی الدین بەگ ) ی ئەرکانی حەربم بکەوێ بۆئەوەی لەم رووەوە هەواڵت پێ بگەیەنێ » •

بەم جۆرە لەئەنقەرە مامەوە

پاش چەند رۆژێك ( محي‌الدین بەگ ) ئاگاداری کردم کە لەیەکێك لە دانیشتنەکانی کونگرەی ( لۆزان ) دا ئینگلیز دەری خستوەکە گوایا بە زۆر نەهاتۆتە لیوای موسڵەوە بەڵکو دانیشتووانی ناوچەکە خۆیان ، و بەتایبەتی کوردەکان ، داوایان کردوە و تورکیان لێ دەرپەڕاندوە هەروەها ئەو مەزبەتانەشیان پیشانی گونگرە داوە کە لەکاتی خۆیدا بەخەڵکی سلێمانیان مۆر کردبوو کە حەز بە حوکمی تورك ناکەن •

بەم جۆرە فڕوفێڵی ئینگلیز ئاشکرا بوو کە ئەوسا ئەم مەزبەتانەیان بۆچی بە خەڵك مۆر ئەکرد !

باش چەند رۆژێك ( حسین رؤوف بەگ ) بانگی کردم و ووتی کە بڕیاریان داوە بە رێگای سیاسی قەزیەی موسڵ حەل بکەن و بۆ ئەمە نائبی موسڵیان بانگ کردۆتەوە بۆ ئەنقەرە و داوایان لە سەفیری تورکیا لەتاران کردوە کە شێخ محمود ببینێ و بۆ کردنەوەی مەزبەتە هەوڵ بدەن ، وە هەروەها بۆ هەمان مەبەست لە موصڵ و کەرکوکیش خەڵك راسپێراوە •

لەدوایدا ( حسین رؤوف بەگ ) ووتی : « تۆش بچۆرەوە ( سەری قامیش ) و لە ئێرانەوە بگەڕێرەوە جنوب و موافقەت و مەزبەتەیان وەربگرە ، و وەرەوە بۆ « نائبی » •

عەرزم کرد کە بۆچی منیشی لەگەڵ فتاح بەگدا نەنارد بۆ تاران فەرمووی : « فتاح بەگ بەرەسمی ئەفسەری ئێمەیە ، لەبەرئەوە تۆ بەرەسمی ناتوانین بنێرین تەنهابەو شێوەیە ئەتوانین کە ووتم • »

بو سبەینێ لەگەڵ خوالێخوش بوو شێخ قادری شێخ نوري بەرزنجیدا کە بەسەفەر هاتبوو بۆ ئەنقەرە چووینە ئەستەموڵ و لەوێ بە دزیەوە چاوم بە ( سید محمد أفندي ) کوڕی ( شێخ قادری نەهری ) کەوت • ئەوان لە هەموو روویەکەوە زۆر داخ لەدڵ بوون •

سواری پاپۆڕ بووم و هاتمە ( تەڕابزون ) و لەوێشەوە بۆ ئەرزورۆم. لەوێ چاوم بە یوزباشی ( عەلی یاوەر ) ی خوشکەزای ( ئەمین چتیر ) کەوت. و بەهۆی ئەویشەوە میرئالایی ( جەنەڕاڵ ) خالد بەگی جبرانی و ( یوسف ضیاء بەگ ) نائبي بتلیس و پێشەواکانی تری ( کۆمەڵەی کورد ) م بینی و بە درێژی باسی وەزعی کوردستانی جنوبی و باری ئینگلیزم عەرزکردن •

( خالد بەگ ) فەرمووی : « کورد زۆر بەدبەختە ، ئیمە لەدەمیکەوە کۆمەڵەمان هەیە و کۆشش ئەکەین بۆ سەربەخۆیی کورد ، و بەتایبەتی لەگەڵ ئینگلیزدا کارمان زۆر کرد و چاوەروانی ئەوەمان ئەکرد کە پاش سەرکەوتنی حولەفا کوردستانیکی گەورە پیک بهێنن کەچی لەباتی ئەمە دەستیان کرد بە خەڵەتاندن و فێڵبازی لەگەڵماندا ، و لەباتی کوردستان ئەرمەنستانیای دروست کرد ، واتا لە ( ئەدەنە ) ئیدارەیەکی ئەرمەنی و لە ( یەریڤان ) یش حوکومەتی ئەرمەنیان پێك هێنا ، و ولایەتەکانی کوردستانی ژوروو : وان ، قارس ، بایەزیتد ، و ئەرزورۆمیشیان خستە سەر ئەم حوکومەتە • هەروەها لەسلیمانیش ئیدارەی ( شێخ محمود ) یان تێك دا و تەنها لە دیاربەکر بەپێی چەند مەرجێکی سەخت بڕیاریان داوە ئیدارەیەکی وردی وا دروست بکەن کە بەئەرمەنیەکان گەمارۆ درابێ • ئیتر چۆن کوردی ولایەتەکانی رۆژهەلات قوبوڵ ئەکەن لە ژێر حوکمی ئەرمەنیدا بژین کە کۆنە دوژمنایەتیمان لە نیواندا هەیە ؟ »

پاش ئەمە جەنابی ( خالد بەگ ) بەدرێژی باسی خەڵەتاندن و فڕوفێڵی ئینگلیزی کرد ، وە دەری خست کە نەئەوان و نە هاوڕێکانیان ناتوانن بەم وەزعە بمێننەوە ، لەبەر ئەوە داوایان لە ئینگلیز کردبوو کە هەڵویستی خۆیان بگۆڕن ، بەلام ئەوان چونکە وایان ئەزانی کە ئیتر کورد هیچ پێ ناکرێ لەبەرئەوە هیچ گوێیان نەدابوونێ •

# بزووتنەوەی مصطفی کەمال

لەم کاتەدا تاقە لەشکری تورك کە بەچەکەوە مابوەوە لەشکرەکەی کاظم ( قەرە پاشا ) بوو کە ئەویش خەریك بوو چەك دانێ ، یان لەراستیدا خەریك بوون چەکی بکەن • هەرلەم کاتەشدا مصطفی کەمالی مفتشی گشتی لەشکر و یاوەری خەلیفەی عثمانی لە ئەستەموڵ لەگەڵ چەند ئینگلیزێکدا گەیشتنە ( ئەرزورۆم ) بۆ چەك کردنی لەشکرەکەی کاظم قەرە پاشا • لەباتی ئەمە مصطفی کەمال لەگەڵ کاظم قەرە و تورك پەروەر و عەشایەرەکاند رێك کەوت و ئینگلیزەکانیان گرت • هەر لەویش( کۆنگرەی ئەرزورۆم ) یان گرت • لەیەکەم کۆبوونەوەدا کە کرا سەد هەزار لیرە کۆکرایە وە بۆ یارمەتی مصطفی کەمال • عەشایر و کوردەکانی ئەو ناوەش کە لەم کاتەدا ئامادە بوون لەگەڵ شەیتانیشدا رێك بکەون بەو مەرجەی لەدەست ئینگلیز و ئەرمەنی رزگاریان بێ بەخۆیان و چەکیانەوە چوونە ناو لەشکری مصطفی کەمالەوە کەلەم کاتەدا بەتەواوی ئیعلانی شەری کردبوو لەگەڵ لەشکری خەلیفەدا کە بەگوێرەی سیاسەتی ئینگلیز ئەجووڵایەوە • لەشکری ( مصطفی کەمال ) هێرشی بردە سەر ئەو لەشکرە ئەرمەنیەی کە هاتبوە سەر سنوور و خراپ شکاندی و کردی بە یەریڤاندا • لەترسی گرتنی پایتەختەکەیان ئەرمەنیەکان شەڕیان وەستاند و چەکیان تەسلیم لەشکری تورك کرد • ئەوانیش وازیان لێ هێنان بەو مەرجەی لەگەڵ ئینگلیزدا پەیوەندی نەگرن و لەگەڵ رووسدا بن بە دۆست کە مصطفی کەمال خۆشی پەیوەندی لەگەڵاندا باش بوو •

بەمجۆرە چەکێکی زۆر دەست لەشکری تورك کەوت و لە جەبهەی

ڕۆژهەڵات دڵنیا بوون • بارەگای سوپا گوێزرایەوە بۆ ( سیواش ) و لەوێشەوە بۆ ئەنقەرە •

( مصطفی کمال ) لەسەر ئیدارەیەکی هاوبەشی برایانە لەگەڵ کوردەکاندا ڕێك کەوت ، و بەم جۆرە « بویوك میللەت مجلسی » ، واتا ئەنجوومەنی میللی گەورە ، دروست بوو ، و زوربەی کوردەکان تیایدا بوون ئەندام و کۆششی تورك و کورد یەك خرا بۆ سەرکەوتنی ئەم راپەڕینە و هەموو پەیوەندیەکیان لەگەڵ حوکومەتی ئەستەمووڵدا بڕی و پەیوەندی دۆستایەتیان لەگەڵ روسیادا بەست •

ئینگلیزەکان ، کە چاوەڕێی ئەم راپەڕینەیان نەئەکرد حەپەسان و نەیان زانی چی بکەن • لە پاشدا کەوتنە بەکار هێنانی پیلانە پیسەکانی خۆیان و ( یۆنان ) یان دژی تورکیا هان دا ، و لەشکری تورکیا ( ئیزمیر ) و گەلی شوێنی تری گرت لە ئەنادۆلی ڕۆژئاوادا • پاش چەند شەڕێکی خوێنین لەشکری خەلیفە و یۆنان شکا و ئەستەموڵ تەسلیم بە لەشکری میللی کرا •

لێرەدا ئینگلیز کەوتە سیاسەت گۆڕین وسیاسەتێکی دوو قۆڵی گرت : لەلایەکەوە هەوڵی دا لەگەڵ مصطفی کەمالدا ڕێك بکەوێ و لەلایەکی تریشەوە تێکۆشا کوردەکان بیزوێنێ بەناوی وەرگرتنی سەربەخۆییەوە و ( شەریف پاشا ) لە ئەوروپا ئامادە کرا کە داوای مافی کورد بکات • بەڵام چونکە شەریف پاشا بە پیلانی ئینگلیز کەوتبوە جموجۆڵ کوردەکان پشتگیریان نەکرد،چونکە ئەیان زانی لەبەرئەوەی ئینگلیز لەم کاتەدا خراپ

تێی گیراوە ئەیەوێ کورد بکات بەقۆچی قوربـانی و شۆرشێکی پـێ هەڵگیرسێنێ بۆ ئەوەی بە بیانووی کوژاندنەوەی شۆرشی کوردەوە لەگەڵ تورکدا دووبارە رێك بکەونەوە و وەك جاران کورد بفرۆشنەوە •

هەر لەم کاتەشدا ( خالد بەگ ) و هاورێکانی لەگەڵ روسدا پەیوەندیان بەستبوو ، وە داوای یارمەتیان لێ کردبوو ، لەمەدا ڕای روس بێ پێچ و پەنا بوو کەوتبوویان : « نامانەوێ وەکـو ئینگلیزەکـان هەڵتـان فریوێنـین و بتان خەڵەتێنین و بڵێین یارمەتیتان ئەدەین • ئێستا ناتوانین هیچتان بۆبکەین چۆنکە نامانەوێ تورك زویر بکەین • » •

بەم جۆرە ، بەقسەی خالدبەگ ، هەڵوێستی کوردەکانی تورکیا زۆر ناسك و پڕ لە مەترسی بوو • زۆریشیان هەوڵ ئەدا کە لەم کاتە ناوەختەدا لەگەڵ تورکدا لێیان نەبێ بەشەڕ • بەڵام دەریشی خست کە لەئەنجامی ( •••••• )(۱) تورك و فێڵبازی ئینگلیزدا زەحمەتە بتوانرێ پارێزگاری ئاشتی بکرێ هەتا هەڵێکیان دەستگیر ئەبێ • دوایی خالد بەگ فەرمووی :

« ئەم قسانە بۆیە ئەڵێم کە بەنهێنی بیان گەیەنیتە ( ئیسماعیل ئاغـای سمکۆ ) لەگەڵ ئەم نامە و سەفەرەیەشدا • ئەم ئیشەش تەنها بە ئێوە ئەکری چونکە تورکەکان لە ئێوە ئەمینن • هەروەها عەرزی ئیسماعیل ئاغاش بکە کە ئەلای خۆیەوە هاوکاری زیاد بکات ، هەروەها هەوڵێش بدات کـــە پەیوەندی لەگەڵ روسدا ببەستێ بەڵکو یارمەتیەکمان بدەن • »

---

(۱) ئەم ووشەیە تەعبیری ئەحمەد تەقی خۆیەتی ، وابزانم ئەویش یەکسەر تەعبیرەکەی خالد بەگی نوسیوە •

« ج • تەقی »

نامه و شفرەکەم لێ وەرگرت و پاش خواحافیزی کردن هاتمـــەوە (سەری قامیش) و لەوێشە بۆ وان کە بچمە لای ئیسماعیل ئاغا و لەوێشەوە بچمەوە جنوب بۆ وەرگرتنی مەزبەتەی نائبی •

ئیسمائیل ئاغا لە کۆنە دێیـــەکی ئەرمەنی (باش قەلا)لـــە نزیك سنووری ئێراندا دائەنیشت • کە چوومە لای رەشید جەودەتیشی لەلابوو •

هەموو راسپاردەکانی خاله بەگم عەرز کرد و نامە و شفرەکەشم دایـــە •

ئیسماعیل ئاغا زۆر سوپای کردم ، هەروەها رەشـــید جەودەتیش وتی : « جدا کاك أحمد شایانی تەقدیرن » [۲] •

دووایش ئیسماعیل ئاغا وتی کە ئەگەر من رازی بم وا بەرابەری ئەم نێرێ بۆ (ورمێ) و من بەشانازیەوە قوبوڵم کرد • لەپاشدا فەرمووی : « لە نۆ باشتر کەسم دەست ناکەوێ • لە ( ورمێ ) قۆنسوڵی رووس ببینە و بەناوی منەوە داوای یارمەتی و دۆستایەتی کوردەکانی ئێران و تورکیـ و عیراقی لێ بکە بۆ چاکەی هەردوولا •

« تێی بگەیەنە کە من پەیمان و قســەی کوردی هەموولایەکم پێ سپێرراوە و تۆش ئەمەی بۆ روون بکەرەوە • ئەگەر روسیا ئامادەیـــە بۆ ئەم یارمەتیە هەتا یادداشـــت و تەرتیبات لـــەم بارەیەوە پێك بهێنین ، وە ئەگەر ئەمەش ناکات با هەر هیچ نەبێ [ تەنها شەخسی خۆم حمایە بکەن ]

---

(۲) بەپێویستم زانی کە ئەم رستەیەش بەبێ دەستکاری بهێڵمەوە • « ج • تەقی »

لەخاكی ئێراندا كە بتوانم لەجێگای خۆمدا پارێزگـاری دەسەڵاتی خۆم بكەم هەتا بزانین پاشەڕۆژ چۆن ئەبێ • »

ئیسماعیل ئاغا نامەیەكیشی دامێ كـە من باوەڕ پێكراوی ئـەوم و پیاوێكیشی لەگەڵدا ناردم كە لە(ورمێ)وە وەرامی پیادا بنێرمەوە •

كە گەیشتینە (ورمێ) پاش ڕۆژێك بە ئاشكرا چوومە قونسوڵخانەی توركیا چونكە پەساپۆرتی توركیم پێبوو ، وە دوای ئـەمـەش بەدزیەوە خۆم كرد بە قۆنسوڵخانەی روسدا • لە مترجمي قۆنسوڵم گەیاند ، كـە ئازربایجانیبوو ، و زبانی توركي و فارسی ئەزانی ، عەرزی بكات پیاوێك لە لایەن ئیسماعیل ئاغاوە ئەیەوێ بیان بینێ • مترجمـەكە پاش چـەند دەقیقەیەك هاتەوە لام و بەسەر چەند ژور و ڕاڕەوێكدا بردمیە ژوورێكی گەورەوە و دانام ، وبەجێی هێشتم • پاش كەمێك لەگـەڵ قۆنسوڵدا هاتنەوە لام • قونسول بە گەرمی بەخێرهاتنی كردم و هەواڵی ئیسماعیل ئاغای پرسی • ئەوسا لەهۆی هاتنەكەم و داخوازیەكانی سمكۆی پرسی ، و منیش دوو راسپاردەكەم پێ ووتن • پاش بیركردنەوەیەكی زۆر ووتی : « پیویستە لەگەڵ مۆسكۆدا قسە بكەم ، لەبەر ئەوە ئەگـەر ئەتوانی لێرە بمێنیەوە پاش یەك هەفتە و هەر لەم كاتـەدا وەرەوە بڕیاری مۆسـكۆت پێ ئەڵێم • » عەرزم كرد كەهاتنی من بۆ (وورمێ) هەر لەبەر ئەمەیە و چەند پێویست بكات ئەمێنمەوە •

لەكاتی دیاریكراودا چوومەوە خزمەت قونسوڵ • فـەرمووی : « مۆسكۆ داوای یەكەمی پێ جێبەجێ ناكرێ • ئێمە چونكـە كوردسـتان خۆش ئەوێ نامانەوی بیان خەڵەتێنین و بلێین ئەیكەین ، لەبـەر ئـەوە

ئەم داواکاریە رەت ئەکەینەوە • دووریش نیە لە پاشە رۆژدا هەر رێـك بکەوین • بەڵام بۆ داوای دووهەم رەنگــه بتوانین • بائیسـماعیل ئاغا لەمەودوا زووزوو پەیوەندیمان لەگــەڵدا بکات بۆ ئـەوەی ئاگــاداری وەزعی بکەم • •

لەپاشدا قونســوڵ ووتی : « مژدەشت بدەمێ کــه لەژێر زەختی وولاتاندا ئینگلیز سلێمانی بەجێ هێشتوه و ئێستا (شێخ محمود) حاکمه و لەژێر دەسەڵاتی کەسدانیه • سەلامیشم پێشکەش بە شێخ بکە • ئەگــەر پیاویشمان ناردە دەوری (هەورامان) بوبینینی جـەنابی شـێخ بایارمەتیـان بدات و ریان بینێ • »

ئەم زانیاریانەم بەپیاوەکەی ئیسماعیل ئاغادا ناردە خزمەتی و خۆم گەڕامەوە و لە رێگای (مامەش) و (مەنگوڕ)ەوە هاتمە پشدەر و لەوێشەوە گەیشتمەوە سلێمانی •

کە گەیشتمە لای جەنابی (شێخ محمود) سڵاو ، و راسپاردەکــەی قونسۆڵم پێ گەیاند • وا دیاربوو کە رووس هێشتا کەسیان نەناردبوو بۆ خزمەتی • شێخ فەرمووی هەرکاتێك پیاویان نارد چیان بوێ ئەیکەم •

لەم ماوەیەدا (فتاح بەگ) گەیشتبووەوە خزمەت شێخ و مەزبەتـەی نائبی خۆی وەرگرتبوو • منیش عەرزم کرد کە مەزبەتە بەمنیش بدات فەرمووی واباشـتر و معقول ترە کــه من لەپشـدەر وەری بگرم • بەم جۆرە چوومەوە لای هەباس ئاغا و کە مەزبەتەکەیان دامێ لەرێگای شەمدنیانەوە گەڕامەوە وان • خۆم لە (وان) مامــەوە و مەزبــەتەکەم

پێشکەش بە حوکومەتی مەرکەزی کرد ، و پاش ماوەیەك موافقەتی نائیبم هات ، بەلاّم درابوومە دەست (سلیمان صبری بەگی) والی و قوماندانی وان هەروەك چۆن موافقتی نائبی فتاح بەگ و ناظم بەگ و هەندێکی تریش کرابوو ، و درابوونە دەست قوماندانی دیاربەکر •

پاش چەند رۆژێك (رشید جەودەت) لە لایەن ئیسماعیل ئاغاوە گەیشتە (وان) • پێی وتم : « وەزعی ئیسماعیل ئاغاباش نیە ، وە هەرچەندە خەسرەوی کوڕیان داوەتەوە بەلاّم پارەکەیان بۆ نەگەڕاندۆتەوە و کوردەکانیش یارمەتی نادەن لەبەر ئەوە پێویستە چارێکی بۆ بکرێ •» منیش بۆ ئەم مەبەستە چوومە لای (سلیمان صبری) والی و

قوماندان کە پیاوێکی باش بوو وەبەپێی توانا حەزی بە یارمەتی دانی کورد و ئیسماعیل ئاغا ئەکرد • بەدرێژی باسی وەزعی پەرێشانی ئاغام بۆ کرد • ئەویش وتی : « ئێستا هەلێکی باشە کە بتوانم خزمەتی ئیسماعیل ئاغابکەم بەو مەرجەی بڕوا و بتمانەمان پێ بکات و گوێ ڕایەڵمان بێ •

« ئێستا ئاسوری و ئەرمەنیەکان زووزوو پەلاماری سنووری موسوڵمانان ئەدەن ، لەبەر ئەوە حوکومەتی تورکیا نیازی هەیە بەرەنگاریان بکات • ئەگەر ئیسماعیل ئاغا نیازی هەیە یارمەتیمان بدات و بێتە(وان) پێشوازیەکی باشی ئەکەم ، چەك و جبەخانەی زۆری ئەدەمێ و هەزار لیرەشی لەپارەکەی ئەدەمەوە ، وە لەکاتی هاتنیشیدا لەسەر گەلێ شتی تر رێك ئەکەوین • »

دوایش ووتی : « ئیستا ئیوه لەگەڵ (یوزباشی وەهبی) یاوەرم و (رشید جەودەتدا ) بچن بۆلای ئاغا و دووسەد لیرەشی بۆبەرە و رازی بکەن بێت بۆ (وان) و دڵسۆزی پیشبان بدات • ئەمە بۆ پاشەرۆژی کورد و ئیسماعیل ئاغاش باشتر ئەبێ • سوێندی شەرەفیشی بۆ ئەخۆم کە نیازم لەگەڵیدا پاکە • • »

دووسەد لیرەکەی دامێ و بەرەو لای ئیسماعیل ئاغا جوولاین • ئەوەی شیاوی باسە کاتێ کە مەفرەزەکەی تورك اسماعیل ئاغای تالآن کردبوو دەهەزار لیرەی ئاڵتونیشی لێ زەوت کردبوو ، وە هەمیشە اسماعیل ئاغا داوای ئەکردەوە • ئەم دوو سەد لیرەیە ئەو دەهەزار لیرە یەبوو •

کە گەیشتینە لای ئیسماعیل ئاغا بەدور و درێژی باسی وەزعمان کرد ، لەدوایدا موافقتی کرد کە بچێت بۆ (وان) هەرچەندە دیاریش بوو کە حەز ناکات ، بەڵام چاری ناچار بوو ، وە ووتیشی : « من لەداخی ئەم کوردە سەگبابانەیە[٢] کە خۆم ئەخەمە باوەشی تورکەوە • ئەوان ئیستا لەم کوێرەدێیەدا وەکو قازی کویر بەجێیان هێشتووم و خۆم تێ ناگەیەنن و بێکەس کەوتووم • • »

پاش ئەمە ئیمە گەڕاینەوە (وان) بۆ ئامادەکردنی تەرتیباتی پێشوازی کردنی ئیسماعیل ئاغا •

---

(٢) زۆر جار چەند وشەیەکی « ناشیرین » لەم یادداشتەدا بەرچاو ئەکەوێت کە بە پێویستم زانیوە وەکو خۆی بمێنێتەوە با وشەی سەرکاغەزیش نەبن ، چونکە بەتەواوی زروف و وەزعی نەفسی قسەکەرەکەی دەرئەخات •

(( ج• تەقی ))

پاش یەك - دوو ڕۆژ ئیسماعیل ئاغا گەیشت و ( سلێمان صبری ) بە تیپێك سەربازەوە چوو بەپیریەوە و بەرێزو احترامێکی زۆرەوە لە کۆشکێکی گەورەدا میوانداری کرد • زۆری پێ نەچوو لە هەموو لایەکەوە کوردەکان هاتنە دەوری و کوڕنووشیان بۆبرد • بەدزیەوە و بەچرپە سمکۆ پێی وتم : « تەماشایان کە ! هەتا دوێنێ بوو مەرحەبایان لێ نەئەکردم کەچی ئێستا وەکو گەماڵ لەبەر پێمدا ئەکەون • بەڵام چارم چیە ئەبێ ئیدارەیان لەگەڵدا بکەم • •

( سلێمان صبری ) بەگ تفەنگ و جبەخانە و هەزار لیرەی لە پارەکەی خۆی دایەوە و ووتیشی :

« حوکومەتی تورکیا بڕیاری داوە کە هەزار سەربازی تورك بەجلی مولکیەوە بەهەموو چەك و جبەخانەوە بخاتە ژێر دەستتەوە ، هەروەها ڕێگای بەهەموو عەشایرەکانیش داوە کە لەگەڵتدا بەشداری بکەن • لەئێرانەوە بزووتنەوەکە دەست پێ بکە و ناوچەی خۆتان بگرنەوە • أحمد ئاغای برات لەجێی خۆت دابنێ و بەخۆت و هەموو هێزتەوە بچن بۆ جنوب بۆ یارمەتی دانی شێخ محمود و هەباس ئاغا و ئەوانی تر • •

ئیسماعیل ئاغا کە ئەم قسانەی بیست وەکو لە دۆزەخەوە بیەن بۆ بەهەشت گەش بووەوە •

لەپاشداوالی ووتی : « باجارێ ئەم باسەبە نهێنی بمێنێتەوە • ئێوە بگەڕێنەوە جێگای خۆتان و خەریکی تەرتیبات بن • منیش هەزار

سەربازەکە لەگەڵ ئەفسەرەکانیاندا ئەنێرمە ( باش قەڵا ) و تەگبیری کۆڕینی جلەکانیان ئەکەم ، کە هەموو شتەکان تەواو بوو خۆم لەگەڵ ئەحمەد تەقیدا دێین بۆ (باش قەڵا) و ئیوەش بانگ ئەکەین •• هەر لەوێشەوە ئەتوانیت جوڵاندنەوەکەت دەست پێبکەی • •

ئیسماعیل ئاغا زۆر بەدڵخۆشیەوە گەڕایەوە جێگای خۆی و ( سلێمان صبری بەگ ) دەستی کرد بە خۆئامادەکرن و رەوانە کردنی سەربازەکان بۆ ( باش قەڵا ) •

زۆری پێ نەچوو لەگەڵ سلێمان صبری بەگدا چووینە ( باش قەڵا ) و ئیسماعیل ئاغاش هات •

ئێمە خەریکی دوا تەرتیبات بووین تەلەگرامێك هات • کە سلێمان صبری بەگ خوێندیەوە رەنگی تێك‌چوو ، بانگی کردینە بارەگای خۆی و تەلەگرامەکەی بۆ خوێندینەوە کە لەلایەن مصطفی کەمالەوە نێررابوو ! تیایدا نووسرابوو :

« لەبەر وەزعی نێوان وولاتان ناچارین بزووتنەوەکەی ئیسماعیل ئاغا دوابخەین • سەربازەکان بنێرنەوە وان • زۆر سەلامم بگەیەنن بە ئیسماعیل ئاغا و ریزی بگرن و هەموو هۆیەکی حەسانەوەی بۆ ئامادە بکەن • خوایاربێ لە پاشەرۆژدا یارمەتی ئەدەین • »

ئیسماعیل ئاغا وەکو مردووی لێ‌هات ، بەڵام چاری نەمابوو •

لەوەپاش پێی وتم •• « تازە هەرگیز هەلی وام دەست ناکەوێت • هەر ئەوەندە بچومایەوە خاکی ئێران و جێگاکانی خۆم بگرتایەوە ئیتر نەئەکەوتمەوە دوای سیاسەتەوە • »

ئاشکرایە کە تورکیا جووڵانەوەکەی سمکۆی بۆ ئەوە ئەویست ئاسووری و نەستوریەکانی پێ تەفروتوونا بکات کە لە سەرسنوری تورکیا دا لەگەڵ ئەشکری تورکدا ، و لە جەبهەی ( جۆلەمێرگ ) و ( هۆرەمار ) دا پێکدا هاتبوون و هێرشیان بردبوو • بەڵام کە لەگەڵ ئینگلیزدا رێك کەوت لەسەرئەوەی بەپێی پەیمانی ( برۆکسل ) نەخشی سنوور بکێشن ئیتر وازی لە ئیسماعیل ئاغا هێنا •

من لە ( وان ) مامەوە هەتا ( عصبة الامم ) بڕیاری دا کە بۆ مەسەلەی ولایەتی موسڵ « دەنگ دان » لەناو دانیشتوەکاندا بکرێ • بەم جۆرە من لەسەر پێشنیاری حوکومەتی مەرکەزی ( سلیمان صبري بەگ ) زانیاری و ئامۆژگاری دامێ کە بچمەوە لای هەباس ئاغاو دۆستانی بۆ ئەوەی لەکاتی هاتنی لیژنەی [ دەنگ کۆ کردنەوە ] بۆ ناویان دەنگ بۆ تورکیا بدەن • ئەوەی شیاوی باسە ( فتاح بەگ ) و ( ناظم بەگ ) یشیان لەگەڵ ئەم لیژنەیەدا ناردبوو •

چونکە زستانەکەی سەخت بوو ، و رێگا گیرابوو ناچار بەرێگای ( سابلاغ ) و ( سەقز ) و ( بانەدا ) ، وەپاش زەحمەتیەکی زۆر گەیشتمەوە پشدەر •

لەم کاتەدا لیژنەی [ دەنگ کۆکردنەوە ] کە هەر شارەکان گەڕابوو وەزیاتر لەگەڵ ئینگلیز ـ دۆستەکاندا دوابوو گەڕابووەوە • میش بە نامەیەك ئاگاداری ( سلێمان صبري ) م کرد کە لیژنەکە نەهاتۆتە لای دانیشتوانی ( پشدەر ) و ( شارباژێر ) • هەروەها ئاگادارم کرد کە زوربەی دانیشتوانی ئەم ناوچانە ئارەزووی سەربەخۆیی ئەکەن • تێشم

گەیاند کە وەك من بزانم ( عصبة الامم ) بڕیار لەسەر ئەو شتە ئـەدات کە بەدڵی ئینگلیز خۆی بێ •

پاش ئەمە لای هەباس ئاغا مامەوە و چاوەڕێی ئەنجامم ئەکرد •

زۆری پێ نەچوو دووبارە پەیوەندی تورك و کورد تێك چوەوە و شەڕ ئەناویاندا بەسەرۆکایەتی ( شێخ سعید ) دەستی پێ کرد •

لەم شەڕەی نێوان کورد و تورکدا دووبارە ئینگلیز بە [ دووسەرە ] لەگەڵ هەردووکیاندا ئەرۆیشت و لەئەنجامدا لەسەر وولایەتی موســڵ لەگەڵ تورکدا رێك کەوتن و کوردەکانی بەرەڵا کرد •

لەم کاتەدا لە سلێمان صبری بەگی والي و قوماندانی وانەوە نامەیەکم وەرگرت کە تیایدا نووسرابوو : « بەداخەوە حوکومەتی تورکیــا ناچارە ئێستا وازلە ولایەتی موسڵ بهێنێ •

« هاورێکانی تۆ ، مەبەستم لەوانەن کەبوون بە نائب ، هەریەکەیان لە (ئەدەنە) ، (ئەزمیر) ، یان لە (ئەستەموڵ) لە ئەموالی بەجێماوی ئەرمەنیەکان خانوویەکی ئەدرێتێ و بەپێی توانای خۆشیان وەزیفەیان ئەدرێتێ ، ئەمــە توش ئەگرێتەوە ، ئەگەر ئارەزووی هاتنەوەت هەیە بۆ تورکیا وابەمــــە پێخوشحاڵ ئەبین ، ئەگەر نیازی هاتنەوەشت نیە ئارزووی خۆتە • »

من لێکم دایەوە ، چۆن بتوانم لەکاتێکدا کە تورك بەم جۆرە خوێنی کورد ئەرێژێ من یارمەتی خانوو ، و مووچە لە دوژمنی نەتەوەکــــەم وەربگرم • کە لەگەڵ هەباس ئاغادا لەم بارەیەوە دواین ئەویش هەمەـــان

زاری و • بەم جۆرە بڕیاری نەچوونەوەم دا • هــەباس ئاغاش مەنۆی (أحمد عثمان) ی هەولێرەوە لەگەڵ ئینگلیزدا ڕێك کەوت لەسـەر ئەو مەرجەی کە بەیەك چاو لەگەڵ بابەکر ئاغادا لە تەشکیلاتی ئیــداری پشدەردا تەماشا بکرێ •

پشدەر ماوەیەك بەبێ تەشکیلات مایەوە هەتا وەزارەتی ( جەمیــل مەدفەعي ) لە ساڵی ١٩٣٣ دا دامەزرا ، ئەوسا تەشکیلاتی ئیداری تێدا کرا و منیش گەڕامەوە سلێمانی •

# کۆتـــایی

**[ خوێنده‌واری به‌ڕێز ! بۆئه‌وه‌ی شێوه‌ی نووسینی ئه‌حمه‌د ته‌قی خۆی شـارەزا بیت ، وا ئەم چه‌ند لاپه‌ڕه‌ی دواییه‌ وه‌کو چۆن خۆی نووسیویه‌ته‌وه‌ بـه‌بێ ده‌ستکاری کردن و گۆڕینی ووشه‌ و ئیملاکانی ئه‌خه‌مه‌ پێش چاو ] ٠**

**« ج٠ته‌قی »**

أمجا به‌پێی ئه‌م یادداشته‌ که‌ به‌صورتیکی مختصر نوسراوه‌ و هموی حقیقته‌ معلوم ئه‌بی که‌ انگلیز هیچ وه‌قتی به‌راستی استقلالیتی کـــورد و کوردستانی نه‌ویستووه‌ و پاش ته‌واو بوونی حربی اولی عالمی ، به‌ موفقتی جولفا ، به‌رغمی ئه‌وه‌ی وعد و وعیدی قطعی هه‌بو له‌ گل زوعه‌ما و کومه‌لی کورده‌کانی شمال ، بوچی به‌ معاهده‌ی سه‌وه‌ر له‌جیاتـــی کوردســـتان ئه‌رمنستانی هینایه‌ وجود و اداره‌ و تشکیلاتی کوردستانی جنوبی که‌ لـه‌ ریاستی شیخ محمووددا پێك هاتبو ، بوچی به‌ قووت و مداخله‌ی نفســـی خویان تیك‌یان دا و ئه‌گر شیخ محمود باش نه‌بو و قابلیتی ئه‌م ریاستـــه‌ی نه‌بوو و پاش أسیری و نفی کردنی ، بوچی تشکیلاتی قه‌ومی‌که‌یان تیك دا و راسته‌ و راست له‌ طرف حاکمی سیاسی میجر سونه‌وه‌ به‌ صورتیکـــی ظالمانه‌ واستبدادانه‌ اداره‌ و استعمار کرا ، خو ئه‌و وقته‌ هیچ ما نعی سیاسی و دولی نه‌بوو به‌رامبر انگلیز و هه‌ر خوی حساب بوله‌ دونیادا و له‌پاشـــان ئه‌هالی کوردستانی جنوبی ، له‌ده‌ست ظلم و تجاوزی حاکمه‌ سیاسی‌کانـــی انگلیز و بی معنایی و تجاوزی آثوری و نسطوری‌کانی مخلص‌یان که‌ خریك

بوون ئه [ ئەقلیته ] کەمه بکەن بە جی نشینی کوردەکانی جنوب و بەعمومی هاتنه حرکت و ئەوره بەرامبر ادارەی انگلیز و قووەتی تورکیان هینایــه رواندیز أمجاکه مجبور بوو به اعادەی نظر و شیخ محمودی له أسارت هینایەوه سلیمانی کەچی دیسانەوه هیچ شتیکی وهای نەکرد که جیگـای اعتماد بی بو شیخ محمود و کوردەکان و تنها هەولی ئەوەی ئەدا کـــه کوردەکانی جنوب بکات بەگژ تورکەکاندا بەبی ئەوەی سیاست و معاملەیەکی راست بکات لەگەل کوردەکان و ئەورەی مرحوم شیخ سعیدی کوردستانی شمالی و شەر و کوشتنی کورد و تورکی بەفرصت زانی و بە سری لەگل تورکەکان ریك کەوت و ریگا و فرصتی بو تورکەکان تأمین کرد کـــه لەشکری تورك ئه استانبول بتوانی بەزویی بیته سەر کوردەکانی دیاربکر و موفق بی بـەســەریانا و لــە جیگای ئەوەی یارمــەتی کوردەکـان بدات و لەســەر ولایتی موصل لەگل تورکــەکان ریك کەوت و همو ملتی کوردەکانی شمال مجبور کرد که بچنەوه باوەش تورکی دوشـمنی خوینینیان و سید طەی مخلص و فداکاری خوشی لەبەر آرزوی تورکەکان مجبور کرد که له رواندیز نەمینی و التجای کرد به حکومی ایران و محو گرایەوه و لەگل وقایعی شەشی أیلول و بزوتنەوه زمانی متصرفتی میرلوا بهاءالدین نوري و سائره که هموی اثباتی ئەوه ئەکات کەهیچ وەقتــی انگلیز بو استقلالیتی کورد و کوردستان به راستی نەجولاوەتەوه و هەرچی کردووه بو پیش کەوتنی سیاست و مصلحت خوی و به صورتیکی وقتی بووه و نوسینەکانی [ مسز بیل ][1] و ( میجر ئەدمونس ) که شاهدی ئـەم حالە بوون اثباتي ئەم نوسینه ئەکات و لەخوطبه و قصه کردنیکی شهید و

---

(۱) دیاره مەبەستی له مس بێله ، نەك مسز بێل «ج٠ت»

زعیمی کورد قاضی محمد له مهاباد هاواری کردبو لەدەست انگلیـــز و فرموبوی ایمه لەم گوشەی کوردستانەدا هێلانەیەکمان بو خومان پیــك هیناوه کەچی انگلیز بەهمو قووت و سیاست یانەوه خەریکن ئەم هیلانەمان بروخینن و لیمان تیك بدەن والحاصل معلومی همو کەسه نفوذی حاکمه زور تأثیری هەیه بو گورینی حەق و حقیقت لەناو مجتمع دا لەگل ئەمشا که خوی مسئولی ئەم همو بەربەرەکانی و ناریکی و بی بەشی ئەم قەومه کورده بووه کەچی بەدعایەی خویان و به تأثیری پروپاغاندەی بعض لەهام پاکانی و اغفال کراوه و هموشتیکی تیك داوه و یاخود کورد لەگل تورك رابطەی هەبووه بەم نوعه مسؤولیتی هەمو شتێك کەوتوته سەر شانی کوردەکـان که یەکتری پیوه اتهام بکەن حقیقت یان لی وون بی و هەر له تفرقه و بی باوەری‌دا بمینن بەرامبر به یەکتری •

تــەواو

زۆر سوپاس بۆ کاك ( فەهمی قەفتان ) ی بەرێز که ئەرکی چـاپ کردنی ئەم یادداشتانەی خسته سەر شانی خۆی • خوا پیاوی وامان بـۆ زیاد بکات • زۆر سوپاسیش بۆ کـاکی خۆشنووس (فەرید عەزیز)ی بەرێز که خەتەکانی نووسی •

« ج • تەقی »